# گەشتێک

## بە نێوان هەورێ و ماکۆک دا

◆ سەربردەو قسەی خۆش ◆

نووسین و ئامادەکردنی :
بەختیار حەمەدەمین بێتواتی
حەمەڕەش مێرگەسەری
محەمەد جەمال توتمەیی



بەرگی یەکەم

نـــــــاوی کـــتێــب :   گەشتێک بەنێوان هەورێ و ماکۆک دا
بــــــــــەرگـــــــی :   یەکەم
بـــــابـــــــــەت :   کەلەپوور ، وێژەیی ، کەلتوور.
نووسین و ئامادەکردنـی :   بەختیار حەمەدەمین بێتواتی
حەمەڕەش مێرگەسەری
محەمەد جەمال توتمەیی
دیـــزایـنی نـــاوەوە :   موحەممەد حوسێن خەتی
بـــــــــــــەرگ:   ابراهیم صالح
چـــــــــــاپ:   یەکەم
چـــــــاپخانە:   هێڤی
ســــــــــــاڵ:   ٢٠٢٣

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارە سپاردنی (١١٠٨) ساڵی ٢٠٢٣ دراوەتێ.

# گەشتێك

## بەنێوان هەورێ و ماكۆك دا

سەربردەو قسەی خۆش

نووسین و ئامادەکردنی
**بەختیار حەمەدەمین بێتواتی**
**حەمەڕەش مێرگەسەری**
**محەمەد جەمال توتمەیی**

## پێشەکی:

... ئەو چیرۆکـــانەی کە لێـــرەدا تۆمـــارکراون، کۆمەڵێـــك ڕووداوو بەسەرهاتی ڕاستەقینەی خەڵکی گوندەکانی دۆڵی نێوان زنجیرە شاخی هەورێ و ماکۆکن، لە سەدەی بیستەمدا، ئاژەڵ و پەلەور و باڵندە و زیـنگە و سروشـتیش، لە پـاڵ مرۆظەکانـدا دەورێکی دیاریـان هەیە، وتەکانیش بەهەمـان شـێوە، وتەی خەڵکی دونیـا دیـدە و بە ئەزمـونی ئەو گونـدانەن، هەر چیرۆکێـك و وتەیەك، پەنـد و ئامۆژگاریيەکیـان تیادایە بۆ ئێمەی نەوەی ئەو سەردەمە، لە چیرۆکەکاندا بەسـەرهاتی خۆش و نـاخۆش دەبیستین و کەلتور و زمان و ڕەسـەنایەتی کوردیان بە ئاشـکرا پێـوە دیـارە، بە جیـاوازی و پێکەوە ژیـانی ئاینەکانیشـەوە، دەمـێکە کـۆکردنەوە و نوسـینەوەیان بە خۆیـانەوە سـەرقاڵیان کردووین، لەوکاتەوەی کە هەستمان بە دەوڵەمەندی کەلتور و وێژەو هونەر و ... هیتد.

خەڵکی دەفەرەکە کـردووە، بێ وچـان نـوکی پێنوسـمان خسـتووەتە سـەر تیـانوس و بەسـەدان لاپەڕەمـان لەو بـوارانەدا نوسـیون، بەسـەلیقەیەکی وورد و خۆشەویسـتییەکی زۆرەوە، خۆمـان لە بەساڵاچوان و ئەوانەی سەربوردەی تاڵ و شیرینیان هەبوون، نزیك کردووەتەوە و بەشێکی زۆری بەسەرهاتەکانیانمان نوسیونەتەوە، لە داڕشتنی بەشێکی ڕووداوەکان کە لە شێوەی چیرۆك دامانڕشتوون، ناوی گوند و کەسە دیارەکانمان کردونەتە ناوی خوازراو، لە هەندێك چیرۆکدا ناوی گوندەکەمان هەر نەنوسیوە، ئەمەش لە نوسینەوەی چیرۆکدا شتێکی ئاساییە. کۆی نوسینەکەمان دابەش کردووە بۆ دوو

بەش، بەشی سەربوردەی تاڵ و شیرین و بەشی ووتەی بەسۆو پێکەنین. سەبارەت بە شێوەی ئاخاوتن، هەوڵماندواە شێوەی ئاخاوتنی خەڵکی دەظەرەکە (خۆشناوەتی)، بە نوسینەکەوە دیاربێت، بە تایبەتی لە وتەکاندا...

بەختیار محەمەدئەمین بێتواتی
حەمەڕەش مێرگەسەری
محمد جمال توتمەیی

## کورد دەڵێ قسەی خۆش (کوێستانی دڵانە) با بزانین وەیە؟

---

*-مام سمایلە کەرتکی توتمە،رۆژەکێ لەگەر احمدی کوڕی ئەچنەوە گوندی ،هاوین بوو،جاران خەڵکی توتمە زۆربەی هاوینان دەچوونە کەپران و تاپاییزان نەدەهاتنەوە،لۆیی تەنها دەپازدە مارێك لەگوندی دەمانەوە،دەچنە کاولە خانی خۆیان بارە زبڵێك دادەگرن و کەس نابێ لەگەریان لەئێستریێ بار بکا،مام سمایلیش ئەرێتە احمدی کوڕی هەروە ماریێ عەسکەری،پێی بریێ باوی وەگۆ بابێ گیسکەکن هەیە لۆن بکوژیتۆوەو جەرگوناوانیش لۆخۆ ببا،احمدیش گۆت چووم پێم گۆت،دیاربوو عەسکەر دوودڵ بوو لەهاتن هەرئەیگۆ ئەمن مام سمایلی ئەناسم ئەزانم چەندی فێرزانە،بەلام داکێی زۆر دەعوا لێکرد و گۆتی کورم خێرە خێر دەهەروو ئەمەش لە مێژە گۆشتن نەخواردیە.مام عەسکەر دەستەکاتە چەقوۆو بەدوای احمدیدا دەروا تا دەگەنە خانی مام سمایلی،کەتەماشا ئەکات ئەوا فەردە زبڵیان داگرتینەو لۆ هەندێ بووە بارە زبڵی لەگەڵ لە ئێستریێ بنێن،مام عەسکەر دەماری گرژەبن و ئەڵێتە مام سمایلی بەخوای سمایل ئەمردی تامنداریشت وەکی خۆ لێنەکردن.

* * * *          * * * *          * * * *

*-عەولا بەگی مەلۆکی لەو ساڵانەی دواییدا ئەمری خوای کرد،پیاوێکی زۆر هەزەلی و قسەخۆش بوو،جارێك لەگەڵ مەلایەکی خزمی لێی دەبیتە مناقەشە،مەلایەکە ئەڵێ(پردی سیرات ئەوەندە باریکە،ئەوەندە تیژە،ئەوەندە تەسکە) کەم کەس دەتوانی بەسەریدا بپەڕێتەوە، عەولابەگیش ئەڵێ(وانیە خوابەرەحمە،حاجی تەهای رووباریێ شەش بزنی هەنە،زستانان پردەکە مەحکەمیان لۆ دروست دەکات لۆ ئەوەی بزنەکان نەکەونە رووباری) قابیلە خوا لەحاجی تەهای بەرەحم تر نەبێ.
*-جارێك هاوین دەبێ عەولابەگ لەسەر جۆخینە،دیاربووە کەدووربووە لەگوند،پەڕە جغارەی لێدەبڕێن،سەروەختێك کابرایەك لەگوندی دێتەخوار،ئەویش بانگی دەکات و داوای هەندێك پەڕە جغارەی لێدەکات،کابراش تازە دەفتەرە جغارەی کڕیەو تەنها چەند پەڕێك لۆخۆی دەگێڕیتەوە ئەوی تر هەمووی دەداتە عەولابەگ،هەرچەندە عەولابەگ دەڵێ ئەوە زۆرن بەڵام کابرا دەیداتێ،پاش ماوەیەکە کەم کابرا دەچێتەلای عەولابەگ و داوای پەڕە جغارەی لێدەکات،عەولا بەگیش دەڵێ وەڵلاهی چاوت وێناکەوی چەندی پێم گۆتی ئەوە زۆرن رازی نەبووی،ئیدی هیچی نەداێ و کابرا گەڕایەوە گوندی.

**** **** ****

*-مەئمونی کوڕی عەولابەگ گێڕایەوەو گۆتی:-

بابم منەتی لەسەر نەکردین و ئەیگۆت بالۆ بگێڕمەوە چۆنم بەخێو کردینە،جارەکێ داکتان بانگی کردم و گۆتی عەولابەگ هیچ ناردن نەمایە،نانیش هەرئەوەندەی سەر سەڵێ مایە،هەستە ئەتووش وەکی عالەمێ عیلاجەکی بکە،گۆتی هەستام بەڕێکەوتم و چوومە هەولێر،هەرچەندی گەڕام و سووڕام هیچ گەنمم دەست نەکەت،بەناچاری چوومە گەراجی خۆشناوان کەلەبن نوتێل مێرگەسۆر بوو،کەچووم سایەق جێبێك دەیگۆت یەك نەفەر،منیش زۆربە عادزی گۆتم کاکی سایەق بابڕۆین،خەریك بووین کەسواری سەیارە ببین ،عەمبارەك فەردە گەنمەکی لەپشت بوو گۆتی کا کامە سەیارە هەوە؟منیش گۆتم بینە کاکە کابرای عەمبار فەردە گەنمەکی لەجێبێ بارکردوو گۆتمە سایەقی بابڕۆین،ئیدی بەڕێکەوتین ،ئنجا ئەیگۆت ئەدی کوڕم ئەمن ئەوهام بەخێوکردینە.

**** **** ****

*-گۆتی جارەکی دیکە بەهەمان شێوە هیچن لەماڕێدا نەمابوو،ئیدی چوومە رانیێ،ئەوەی پێم بوو تەنها دوو درهەم بوون،گۆتم دەبا جارێ پاکەتەکی بکڕم خواکەریمە،چوومە لای پاکەت فرۆشێك پاکەتێکی بەغدام لێکڕی کەبە درهەم و نیوەکی بوو،منیش دوودرهەمەکەم دایە پاکەت فرۆشەکە،وەختەکی کابرای پاکەت فرۆش هەر ژماردی ،ژماردی هەژدە درهەم و نیوی دامەوە،وای زانی بوو دینارێکم دایێ،پارەکەم خستە باخەڵم و چوومە بازاڕی هەرچی پێداویستی بوو کڕیم،ئەدی کوڕم ئەوهام بەخێوکردینە.

*-خــزمەكن هەیە زوو زوو داخیلــی خەمســتەخانێ كــرێ و زەخـــت و ســوكەری و كۆرســترۆلی دایــم فــولە, پــارێزێش لە چ ناكــات جفــارە و چەوری و شیرنی وەكی كابرایەكی ساخ دەخـوات,رۆژەكی لە دەعـوەتەكی بووین گۆشتی حەیوانی با دەدا و بیبسی لە دوو فڕەكرد,

مامی گۆتی: كورِم جەمال برِەكت ئاگا لە خۆ بی پارێزێ بكە!!

جەمال پاری دەناو زاری دابـوو و بیبسـی لە دوو فـڕ كـرد و گـۆتی : ئەرێ خزمینە پارێز لە خەمان دەكرێ؟

**** **** ****

*-پلكە خاتوون لە عەسرێرا هەتا نزیك بانگی مەغریبێ لە مارە جیرانان بوو

,وەختی چـوونەوێ گۆتیـان پلـكە خـاتوون مەچـۆوە كفـتەی روانـدزیانن لێنانینە,

گۆتی : والله دەچمەوە.

گۆتیـان: لـۆ ئەوهـا ئیلحـاحی لەسـەر چـوونەوێ دیـارە شـیوەكی خۆشـو هەیە؟

گـۆتی: ئەرێ والله شــیوەكی نوێمــان لێنــایە پێشــدەجی شــیوەكی خـۆش بی,وەختی عەسرێ كەداتمە ئێرە گۆتمە گورێ كیژم چت لێنـایە؟ گۆتی دایە رجیمم كردیە, جا دەچمەوە ئەو رجیمەی دەخۆم بزانم كوە,!!!!

**** **** ****

*-جارێکیـــــان مەلا عیســــــای هەرتەل لەکـــــۆیە دەگەڕێـــــتەوە خۆشـــناوەتی،دەگاتە گونـــدی سکتان،ســـەیرەکات خەڵـــکەکە زۆر بە گەرمی پێشـوازی لێدەکەن،هەموویان بەریـزەوە وەسـتاون و یەکەیەکە دەستی مـاچ دەکەن،ئەویش کەعەبایەکی بەسـەر ملیدا دادابوو،گۆتی خـزمینە مـن زۆر جـاری تـر بێرەدا هـاتووم قەت بەم شـێوەیە پێشـوازیم لێنەکراوە،هـۆی چیە؟ئەوانـیش گۆتبوویـان قوربـان تـۆ شـێخی هەقی ئەوەت هەیە زیارەتـت بکەین،وایـان زانیبـوو شـێخە،مەلا عیسـاش کەردێنێکـی ســپی نـووراني پێوەبووە،بەدەسـت دەیگـرێ و دەیهێنێـتە پێشـەوەو تفێك بە ریشـەکەیدا دەکات و ئەڵێ (عیسـا ئەوە چەنـد ساڵە عیلم دەخوێنی،بەکەرت تێدەگەن و حیسابی کەرت بۆ دەکەن).

**** **** ****

*-جارێکیـــان مەلا صـــدیقە فەنـــدی نازەنینی،کەحـــاکمێکی گەورە بـووە،ئەچیتە هەرتەل و لای مەلا عیسـا بـۆ خوێنـدن، ئەڵێ بـۆ خـوێنـدن هـاتووم، مەلا عیسـاش دەڵێ بەخێرییێ ســەرچاوم، هەمـوو دەرسـێکت پێـدەڵێم،تەنها(جامی) نەبێ، کەکتێبێکـی شــەرعی بـووە،ئەویش ئەڵێ بـۆچی؟ مەلا عیسـاش ئەڵێ (ئەو دەرسـە مەلا رەسـولی ئەنـدێکی لەبیری بـردمەوە) هەرچەنـدی بـۆم شـەرح دەکـرد تێنەگەیشـت،تاوای لێهـات منیش لەبیرم چووەوە.

**** **** ****

*-بەرەحمەت بی مام عەسکەری توتمە،کەساڵی ١٩٨٠ لەناو رەزدا بە گــوللەی هەلیکــۆپتەر شـــەهید بوو،پیـــاوێکی زۆ رقســـە خـــۆش بـوو،ئەیگێڕایەوە و ئەیگۆت:-حەزم لە کچێك نەکرد،رۆژێك گەیشـتینە یەك و داوای مـاچێکم لێکـرد،ئەویش گـۆتی قەیناکا ماچـت دەدەمێ بەڵام نـابێ لەلای خەڵکی بـاس بکەی،منـیش پێم گـۆت نـامەوێ،ئەمن کەیفێ هەندێم پێدێ بڵێم فلانە کچم ماچ کردیە.

*-جارێــك حـــاجی مەلا حەمیــد ســـینگي کەربەســـتنەوێی لــێ بـــزر دەبێ،لەرێیەکـی دەگـاتە مــام عەسـکەری لێـي دەپرسـێ ،چ سـینگت نەدیتیــنەوە؟ ئەویــش ئەڵـێ ســینگەکی خــوارو خـێچم دیتیتــۆ،هەوە ظ،حـاجی مەلا حەمیـدیش ئەڵێ ،سـینگی مـن ئـي راسـت بـوو ئەگەر دابیتتە تەقرێ.

**** **** ****

*-لە چایخانەی مام سلێمان گەیشتە حاجي مەغدیدي

مام سولێمان: سەلام و عەلێکوم مەغۆ کوي؟

حاجي مەغدید: وە عەلەیکوم سەلام سولێمان زۆری باشم یاخوا بچیە بەهەشتێ.

مام سولێمان: قوربانی خۆت و ئەو دوعایەي بم کە دەیکەي و یاخوا قبوڵ بی.

حاجي مەغدید : زۆرت حەز لێیە بچیە بەهەشتێ سولێمان؟

مام سولێمان: ئەرێ واللە مەغۆ وەختە لۆ بەهەشتێ شێت بم.

حاجی مەغدید: مادام وەیە رەبی هەر ئەلعان بچی دەقەکي دی تاخیر نەبی .

مام سولێمان: ئەی رەبی داوەشێي لەگەڵ خۆت و دوعاي لۆم دەکەی مەغۆ ، رەبی زمانت بە برین چی باشە.

**** **** ****

*-ساری ۲۰۰۳ وەختی ئەمەریکا هەرەشەی لە عێراقي دەکرد لە کوردستانی خۆمان دەنگ و باس هەبوو کە سەدام کیمیایي لە کوردستان دەدات,خەرك هەموو خەریکی کرینی نایلۆنی بوون لۆ دەرکەو پەنجەران و هەندەکیش جۆرکیان پری رەژوو و خوێ دەکرد بە حیساب قیناعی دروستە دەکەن.

لە یەکەك لەو گوندانەی خۆشمان ئەنجومەن مار بە مار دەگەرا و خەرکی نەسیحەت دەکرد نایلۆنی بکرن خۆ بپارێزن ، شەر تەواو بوو الحمدللە سەدامیش نەما و کیمیاشي لێ نەدا, ئەوجا پیرە ژنەك وەکی بروسکێ خۆی گەیاندە ئەنجومەنی و قیژاندی و گۆتی: ئەنجومەنی چ نەزان بابي ۳٤ دینارانت نایلۆن پێ کریم وچ کیمیاشي لێ نەداین ، باشە ئەمن ئەلعان ئەو پارەی لە کێ وەرگرمەوە لە قەبری بابی تووي دەرینم یان لە هی سەدامی؟

**** **** ****

*- قسەیەکی حاجی مەلا زادەی هەرتەلی ئەگێڕنەوە،کەهەمیشە پیاوێکی قسەخۆش و حەق و رەق بووە،شەرمی لەکەس نەکردووە،هەموو ژیانی پڕبووە لەقسەی سەیر،

جارێکیان پیاوێکی هەرتەلي بەناوی (حاجی قادر) کەری لێ بزر ئەبی،زۆر شوێن ئەگەڕێ بەڵام نەی دۆزیبووەوە،دەگەڕێتەوە ناو ئاوایي (بەرۆژە)حاجی مەلا زادەش لەحاجی قادر ئەپرسێ و پێي ئەڵێ حاجی قادر کەرت دیتەوە یان نا؟حاجی قادریش ئەڵێ وەڵلاچوومە(مێرگەسەرو چیوەو شیرەو بێراوەو دەشتی بالیسان و توتمەو شێخ وەسانان و کانی بەردودەرەشێرو وەرەو نواوەو سەروچاوەو)ئیدی بەو شێوەیە ئەو شوێنانە بەدوای یەکدا ریز ئەکات ،حاجی مەلا زادەش تووڕە ئەبێ و خۆی لێ تووڕە ئەکات و پێي ئەڵێ( قالە کوڕ کەرت دیتەوە یان نا؟ ئەتوو بۆمن باسي چي ئەکەی ؟بۆ من بامي (بەدرو چونەین ) ئەکەی،دیتتەوە یان نا؟بەم شێوەیە ئەبێتە پێکەنین و ئێستاش نەزانرا کەئایا کەری دیتەوە یان نا.

*****          ****          ****

-ئەگێڕنەوە و ئەڵێن:

کابرایەك ماوەی دەرۆژ چووە لۆ کاروانکردنێ،دوای ئەو ماوەیە لەکاتی گەڕانەوەی لەشوێنەکی لە ولاخی دائەبەزێ لۆ میزکردنێ،لەو کاتەدا زەنگە سوورەیەك بەسەری زەکەریەوە دەدات،زۆر بە ئازاردەبێ زەکەریشی زۆر ستوور دەبێ،هەرخێرا خۆی دەگەیەنێتەوە ماڵێ و هەرلە حەوشەی هاواردەکاو ئەڵێ:

فاتێ خۆ حازر کە جارەکی دي ئەوها بەستووری نابینیەوە.

*-جارێکیـان مـامە حەمەی بێتـواتە میـوانی حـاجی حسـینی بێکێڵـی ئەبێت،حاجی حسین دوو ژنی دەبن،هیچیان ئاگایان لەوی دیکەی نیەو ئێـوارە نیسـکێنەیان هەبـووە،هەریەك لەژنەکـانی چەنگێـك خـوێ لەنیسکەکە دەکات،مامەحەمەئاگاي لەوە بـووە کەهەریەك لەژنەکانی چەنگێك خوێی تێکردووە،هیچ خۆی تێك نەداو کاتی خواردن نیسکەکە دێنن،ئیـدی دەسـت ئەکەن بەخـواردنی و کەس نـاڵێ سـوێرە،ئەویش خـۆی بێـدەنگ دەکـات،وەك ئەوان هەنـدێك خـواردن ئەخـوات ودوای نـانخواردن ئەگەڕێـتەوە ماڵەوە،کاتێـك ئەگـاتە نزیـك گونـدی دواوە،یەکسـەر بە سـواری ئەسـپەکەی دەگەڕێـتەوە بێکێڵی،حـاجی حسـینیش بـانگی دەکـات و ئەڵێ:هامـامەحەمە خێرە گەڕایەوە؟خـۆ چ نەقەومایە؟

مـامەحەمەش ئەڵێ:نـاوەڵڵا هـیچ نەقەومایە،تەنها لـۆ ئەوە هـاتیمەتەوە ئێـــوارە نیســـکەکەتان بەدوو دەســـت خـــوێی تێکرابـــوو،زۆریش سـوێربوو،جالۆیە گەڕامەوە تـابەکەرم نەزانن،نەڵـێن هەسـتی بەهـیچ نەکرد.

**** **** ****

*-مـام خەلـیفە حەمەد خەرکی بێتـواتە بوو،سـەردەمی فەقیری دەچیـتە کاروانی، پـاییزێ زوو دەڕوا لـۆ کاروانی،بەڵام مـام خەلـیفە خـوا عەفـووی بکـات ،تەبێعـاتێکی هەبـوو،زۆر خـاو و خلـیچ و لەسـەر خۆبوو،ئەیـان گێڕایەوە ئەگەر چووبـایە لـۆ دەسـت نـوێژ شووشـتنەکی سـێ سـعاتی پێـدەچوو،لۆ نـوێژ کردنەکی دووسـعاتی دەویسـت،جاکەچیتە کـاروانی

سەرەتای پاییز بووە،کەچی ئاخیری بەهاریّ گەڕایتەوە،لەماڵیش دەستی لێدەشۆن ودەڕێن مردیەو تازیەی لۆ دادەنێن،

بەڵام کـاتەك لەکۆتـایي بەهـاریّ گەڕایـتەوە دەگـاتە نزیـك گونـدی،لەکانیّ(بیران) کەپێـنج دەقـقە لەگونـدی دووربـووە،ئەریّ هەرئەمـرین دەبـا چـایەکیش لێنـێم و بیخـۆمەوە ئەوجـا دەچـمەوە ماریّ،بارەکەی لێئەکاتەوەو چادەبەر ئاگری دەنێ و لەناکاو کابرایەکی خەرکی بێتـواتەی دەیگـاتێ و مانـدی نەبـوونی لێـدەکات،پێی ئەریّ ئەوە خەریکی چی مام خەلیفە؟چەنـد مـانگە تازیەشـت کۆتـایي هـاتیە تـازە بەتازە چای لێدەنێي؟ئەو هەموو ماڵ و منداڵەت کوشت هێندەی لۆت بگرین،پێلەقەکی لەبەر چادانی هەڵئەدات و بەزۆری دەینێریتەوە .

**** **** ****

*-لە پاشی ئینتیفـازەی وردە وردە خەرك دەگەڕانەوە گونـدان و خـانی بە دار و بەرد و خشـتی دروسـتدەکردەوە,لە یەکەك لەو گونـدانەی کـوردەواریش پـاش گەرانەوەی ژمـارەکی باشـی خەرکـی بڕیاریانـدا مزگەفتەکی دروسـت بـکەنەوە, دەسـتیان بە خشـت دروسـتکردنێ کـرد, مامەنـد بەوێـدا رەت بـوو گـۆتی وەکی تێـدەفکرم ئەو مـزگەفتە تەواو نـابی, دیـوار کـرا و مامەنـد هەمـان قسـەی دەکـردەوە ,مزگەفـت دارە رێژکراو خۆرەبان کرا مامەند هەر عینادی دەکرد و دەیگۆ ئەو مزگەفتە تەواو نـابی, مزگەفـت تەواو بـوو رۆژی جـومعەی داهـات و خـوتبەی تێدا درا و خەرك گۆتیـان هـا مامەنـد ئەوە مزگەفـت تەواو بـوو ئەلعـان چ

دەرێی؟ مامەنـدی گـۆتی : جـا ئەوە مـزگەفتیش تەواو بـوو ! بە هەمـوو عەقـری خـۆ بەتەمـان بە مزگەفـت دروسـتکرنەکی و دوو رکـات نـوێژان خوا بووباتە بەهەشتێ؟ واللە چاو و وە بەهەشتێ ناکەوي هێکان!!

**** **** ****

*-تازە خەتی مۆبایلی هـاتبۆ مەنتیقەی خـانزاد بەخـۆ بە خەرکی گونـدی لـۆ عـامیەی چـوونە تـاتوکی پشـتی چیـوەی لـۆ کەنگـران, لە گەڕانەوەی تەنەکتەر عاسێ بـوو دەقورێدا خـانزادێ تەلەفـۆن لـۆ مامەنـدی کـرد و گۆتی مامەنـد لەوانەیە ئەمـن درەنـگ بێمەوە تەرەکتەر چەقـیە کۆریتی چاك بگرە و شیوێش لۆ منداران گەرم کەوە تا دێمەوە.

مامەند گۆتی باشە بەس خۆ کەنگرت کردینە چ برِ؟ خانزاد گۆتی ئەرێ واللە فەردەکم کردینە و چاکیشم کردینە حازرن لۆ ناو مەنجەرێ

مامەند گۆتی: ئەك دەستت خۆش بي و خوا حافیز, تەرەکتەر لە قورێ هاتە دەرێ و مامەند وەکی هەستی کرد دەنگی خانزادێ هەر دێت لەناو تەلەفۆنی قەپاتی نەکردیە!! مامەند هاواری کرد کچێ خانێ قەپات کە با وەحدەت نەڕوا کەلکی نەبوو خانزاد لەبەر دەنگی تەنەکتەری گوێی لە مامەندی نەبوو هەندی مامەندی هـاوار کـرد کچێ خـانێ دوگمەی سۆر لێدە بێ کەلك بوو هەتا گەیشتەوە مارێ وەحدۆکە قلوف بوو چي تێدا نەما, هەر خانزاد گەیشتەوە مارێ و مامەندی غاردایێ, کچێ هەی سەر بە هەش ئەوە لۆ مۆبایلت قەپات نەکردەوە , پسام هەندی هاوار کەم خـۆ وەحدەت خەلاس بـوو! خـانزاد گـۆتی جـا ئەمـن لەبەر دەنگی

تەنەکتەری گوێ لێ نەبووە خۆ ئەتوو دەتزانی قەپات نەبووە لۆچ ئەتوو قەپات ناکرد ها ؟؟

مامەند گۆتی: چما ئەمن تەلەفۆن لۆ توو کردیە تا قەپات کەم هێڕێ!!!!

**** **** ****

*-سۆفی کەریم لە شاری هاتەوە خزم و ناسیار چوونە بەخێر هاتنەوەی و گۆتیان ها مام سۆفی چت دیت چت نەدیت شار کوو بوو؟

سۆفی کەریم گۆتی چوو لێ بشارمەوە خزمینە بە چاکی قونەبانان ئاسنم دیت زەلامی سوار ببوو لاقي لێدەبزاوت وەکی هێستری دەرۆیشت بە خۆ!!

خەرك ئەو قسەیان چ نەچۆوە عاقری بەس چشیان نەگۆ.

پاشی دوو سێ ساری دی مام سۆفی چۆوە شاری کە هاتەوە خەرك غاریانداوە مارێ و گۆتیان ها مام سۆفی ئەو جارەی چت دیت هێستری ئاسن مابوون؟

مام سۆفی گۆتی قورعان بە حەقت بە ساحێبت ئەو جارەی هۆدە خانیم دیت خەرکی لەناودا دانیشتبوو لە عاردیە رۆیي بەخۆ!!

خەرکەکە زۆر دریان بەو قسانەی مام سۆفی توند بوو بەس لەبەر مام سۆفی ئەو جارەش بێ دەنگ بوون.

سێ چار ساری دی پێچوون مام سۆفی چۆوە شاري و لە هاتنەوێ عالەمی چۆوە کنێ و گۆتیان مام سۆفی دەنگ و بامی غورفە خانێ چ بوو هەر مابوون و لە عاردیە رۆیشتن؟

مام سۆفی گۆتی بە زات و سیفەتێ خوای ئەو جارەم هۆدە خانی دیت لە عاسمانێ دەفِری!!!!

**** **** ****

*-بێوەژنەکی بێ کەس لە گوندی هەبوو کەسی نەبوو غەیری تاکە کورەکی پازدە شازدە ساری، رۆژەکی کورێژگە لەگەر کوری مام سۆفی بەشەڕ دێن و سەری کوری مام سۆفی دەشکینی و هەردێتە مارێ کوێخاي گوندی، کوێخا لە دوو مام سۆفی دەنێری لۆ سولحێ مام سۆفی دەرێ سولحێ ناکەم یان دەیکوژم یان دەبي سێ سەد دینارم بداتێ ئێ کورەش فەقیرە ئەو مەبلەغە پارە لە هەموو گوندیش نیە تا ئەو هەیبی، کوێخا دەرێ مام سۆفی ئەوە نیشانەی سولح نەکردنێیە دەنا هەمووە زانین ئەو پارە بەمنیش هەرناستی تا وەو کورەی راگا؟

مام سۆفی گۆتی ئەوە زانیمان پارەی نیە خۆ داکی هەیە با داکێم داتێ، وەکی ئەو قسەی کرد خەرك هەموو لایەنگری کورەی بوون گۆتیان مام سۆفی شتەکەت بێتام کرد ئەو قسانە لەتوو ناوەشێنەوە ئەتووش نەبای ئەلعان حی خەرابە پێنەکردی ، دو مندار بەشەڕ هاتینە و سبەیێ پێك دێنەوە و لۆشت نیە دەست بکەیە ئەو کورەی بەخوای لێت قبوور ناکەین.

کـوڕە بە بێ ترمـی گەڕاوە مـارێ و داکی گـۆتی  هـاکوڕم سـوڵحیان لـۆ کردی؟

کـوڕ گـۆتی نـاواللە دایە مـام سـۆفی قسـەی حەلەق و بەلەقیەکـردن دەیگۆت دەبی داکێ خۆم دەبێ دەنا دە تکوژم!

داکی گـۆتی جـا کـوڕم نـاگری ئەو فیتـنەی بەمـن بکـوژێتەوە و ئەتـوو نەکـوژن هەزار شـوکر لـۆ خـوای ئەمـن لەبەرە تـوو نەك جـارەك سـەد جاریش بي خۆ داوێمە ناو ناگری داك بە قوربانی توو بي رۆرە, ما ئەمن چەند کوڕم هەنە؟؟؟

****          ****          ****

*-مـام عوسـمان تەبیعەتەکی زۆر سـەیری هەبـو کەس نـاوێرا دەسـتی لـۆ کــۆنتڕۆڵی تەلەفزیــۆنی ببــات , ئەگەر یەکەك حەزی لێبــا تەماشــای کەنــاڵەکی دی بکـات بە مــام عوســمانیان دەگــۆ و ئەو کەنــاڵەکەی دەگـۆڕی کـۆنتڕۆڵی لەبەر پشـتێ دانـا,هەر دەسـتێت وە کـۆنتڕۆڵی کەتبـا شـەڕەکی دەقەوماند, ئێوارەکی مەلای گونـدیان میـوان بـوو مەلا دەسـتی لـۆ کۆنتڕۆڵی بـرد مـام عوسـمان لە دەسـتی راپـوچکڕی, مەلا هیکەکی لە خـۆ دیـتَََََ!!!!! گۆتی مـام عوسـمان چـیە خـۆ کۆنترۆڵی نـاخۆم لـۆ وەکی منداران لە دەستم دەردینی ؟؟؟؟

پلـکە فـاتمێ وەگـۆ دەنـا مـام وەسـتا بەخـوای ئەوە حـاری مەیە کەس نەوێری دەستی لۆ کۆنترۆڵی ببات وەکی دەکاتە هەرا و حەیانە بات.

مەلا گۆتی مام عوسمان ئەو قسانە راستن؟ شەڕی لەسەر کۆنترۆڵی دەگەر مامۆژنە فاتمێ و مندارانە کەی؟ کۆنترۆڵ چیە لۆ وێیان نادەی؟؟؟مام عوسمان گۆتی مام وەستا کۆنترۆڵی مارێم دە دەستەخۆ دانەمایە دەوەوێ کۆنترۆڵی تەلەفیزیۆنیشم لە بن دەستی دەر بینن ؟؟؟ ئەنگۆ لە خوای ناترسێن ها؟؟؟؟؟

**** **** ****

*-مام قادری لەسەر شێستی سەیارەی لێدابوو بردیانە تەواری.

پۆلیس هات ئیفادەی وەرگری گۆتی: مامە چ سەیارەك بوو؟

مام قادر گۆتی: قەمەرەکی سپی

پۆلیس گۆتی :رەقەمت نەگرت ؟

مام قادر گۆتی : بەرێ واللە بەس ئەو سەگ بابەی بە بورغیانی هەند توند کردبوو پێم لێنەبۆوە!!!

**** **** ****

*-چووبوینه ماریٚ خزمەکی دەعمی کردبوو لە هەیوانیٚ دانیشتبووین داکی و خەسووی لەکن یەك دانیشتبوون چاویانەدا مۆبایلی داکێی وەگۆته خەسویٚ حەیشیٚ لۆ نایەی بچینه کن پلکه ئامانیٚ وارێن چاویا عەمەلیات کردینه ؟؟

حەیشیٚ وەگۆ:

فاتم,نابینی خەریکی چاتم ؟

دەنا بەخوای دەگەرته هاتم

**** **** ****

*-تازە سەحن و سەتەلایتی ئەنەلۆگ هاتبوون زۆرە گران بوون,لامپی پارەکی باشیه کرد,مامۆستا قادر سەحنەکی بە ١٠ هەزار دیناری سویسری کریبوو, بەس زۆر دەترسا لامپەکەی لێ بدزن,لۆیه قسەکی لە کۆرانیٚ بلاوکردبۆوە دەیگۆ کسۆکەکی زۆر درم لەکن برادەرەکی هینایه چ متاقان ناکات تا کابرای نەگری نایبنی هەند بێدەنگە!!!! لەسەر بانم بەستیتەوە .

تۆفیق و سدیق مەراقیانکرد ئەو کسۆکەی ببینن بزانن کوەو چەندی گەورەیە.

رۆژەکی پاشی عەسریٚ ماریٚ مامۆستا قادری لە ماریٚ نابن و سدیق و تۆفیق بە فرسەتیان زانی بچن چاو لەو کسۆکەی بکەن, سدیق وەسەر بانی کەت هەر راست گەراوە بەس رەنگی سپی ببوو دەلەرزی لە ترسان.

تۆفیق گۆتی: چیە سدیق ئەو کسۆکە ئەوەندە ئی گەورە و هارە ؟ درانی تیژن؟ لۆ ئەوها هەترەشت چووە یاخوا زراوت چیٚ!

سدیق گۆتی: والله کسۆکم هەر نەدیت!

تۆفیق گۆتی: ئەدی لە چ ترسای ئەوهەت لێهاتیە و رەنگت پەڕیە؟

سـدیق گۆتی:کـوڕە کـو نەترسـێم والله بەس ئەو قـاپەی شـیوی لـۆ تێـدەکەن دوو مەتـر دەبی،دەبی بەخـۆ چەنـدی گەورە بـی مـارەوەدان؟ والله هەردووکانن بە جەمەکێ خوا!!!!!

**** **** ****

*-رەمەزان بـوو ،مـارم لەتـوتمێ بـوو سـاری نـۆهەت و دوو،خـار احمـدی مـام عـاجیم جیران بـوو،لەگەر مـام اسـماعیلی رەحمەتی،ئەوێ سـارێ زۆرن بەخۆشـی رابوارد،هێـواران وەکی لەئیشـی داتینـۆ هەتـا وەختی نووسـتنێ لەکـن ئێـك بووین،عـادەتەن پیـاو کەبەرۆژی بـي مـرازانە گێڕی،فـرانە خـواردن خۆشـە،ئەمنیش گـۆ جەمـاعەت بەزاتـێ خـوای کەس هەنـدی مـن عەزێ لە ماشێ ناکا،ئەلعـان ماشـەکێت لـۆ لێنـێن و هـورتکە نـانە رەقیشی تێبکەی،بەراسـتی بەلەزەتە،خـار احمـدیش گۆت: هەموو شتەك خواردن بی ،ماش هەر هیچ نیە،ئەمنیش گۆ خـارە احمـد بەناوێ خوای ئەلعانێ چ ماشـێم لـۆ لێنین چ برنج و مریشکی،شـەرت بی بـرنج و مریشـکیە خـۆم ،ماشێ ناخۆم،خاراحمـدیش گۆت،سـبحان الله لەو تەبێعـاتەی.دوایێ فکـری کـردۆو گۆتی ئەرێ محمدی خـوارزا ئەتـوو لەو بەینەی فێرەك لەمن نەکرد؟.

**** **** ****

*-مام عەولا چووە دختۆری گۆتی : دختۆر شەوانم خەو لێناکەوی هەندی خۆ هەرگێر وەرگێرەکەم کەلکی نیە, چ بکەم ؟ چارەکم لۆ ببینەوە خێرتە گاتێ!

دختۆر گۆتی : خارە شەوان وەختی نوستنێ هەرچی خەم وخەفەتن لە دری خۆی هەردە دەرێ و فکر لە هیچ مەکەوە .

مام عەولای وەگۆ: فاتمێش

**** **** ****

*-حاجی کەریمی واگۆ کورد دەڵێ ئەوەی بە ئاسانی پەیدای بکەی بە ئاسانیش لە دەستی دەدەی بەس بەخوای وەنیە ئەمن بەخۆشم نزانم ئەو شینە ورگەم بە چ پەیدا کرد ئەلعانم بە چ کولل و بابەتان لە کۆر نابیتەوە .

**** **** ****

*-لەبن دیواری مزگەفتێ دانیشتبووین , شێرۆی وەگۆتە مەلا خالیدی: مام وەستا ئەمن دەمەوێ وەکی تۆو عەمرم درێژ بي بەس گەلەك لە مردنێ ترسێم چ بکەم تا فکر لە مردنێ نەکەمەوە ؟

مەلا خالیدی وەگۆ : ژنێ بینە.

شیرۆي وەگۆ: لۆ مامۆستا ژن هینان عەمری درێژ دەکات؟

مەلا خالیدی وەگۆ: نا, بەس وەتلێدەکا فکر لە مردنێ نەکەیەوە.

شیرۆی وەگۆ: لە خۆشیان یان لە خەمان؟

مەلا خالیدی وەگۆ: جاری یەکەم لە خۆشیان و دوایێش لەبەرخەمان.

*-مام کەمالی وەگۆ :خەجێ وەبیرتە ٥٠ سار پێشی ئەلعان چەندن در خۆش بوو؟

پلکە خەجێ وەگۆ: جا کەمال ٥٠ سار پێشی ئەلعان کوا ئەمن بووبوومە ني توو و یەکترنە ناسی؟

مام کەمالی وەگۆ: ئاخر ئەمنیش مەخسەدم ئەوەیە چەند خۆش بوو پێش ئەوەی ببیە ني من و ئێکدی بناسین!

**** **** ****

*-میرانی جەمیل بەگی مەلۆکی پیاوەکی خانەدان بوو،جوەکی جیران بوو،دیارە جوەکە ئێوارێ گوێي دایتە رادیۆی ئیسرائیلی و لەهەواڵەکاندا پێشبینی ئەوەکراوە کەوا شەو سعات حەفت و نیو مانگ دەگیرێ،جوەکەش بانگی میرانی جەمیل بەگ دەکات و پێي دەڵێ:میران ئەو شەو سعات حەفت و نیوی مانگ دەگیرێ،میرانیش دەڵێ:کورە دەبڕۆ قاحپە بابی خوێڕي مانگ گیرانێ چ؟

کەشەو دادێ و سعات ئەبیتە حەفت و نیو،بەرە بەرە مانگ دەگیرێ و جوەکەش بانگی میراني دەکات و ئەڵێ :نەمگۆ میران مانگ دەگیرێ؟

میرانیش ئەڵێ:ئەوجا چ دەڵێي ببمە جوو؟

**** **** ****

*-وەختی بەهارێ بوو دەگەر هەندەك برادەران مەوعیدەكن هەبوو لە دیوی هەربرێ,بەرام ئەمە زووتر وەرێ كەتین و گەیشتینە دۆرە تیرێ.

برادەرەك گۆتی جارێ زووە لۆ لەكن ئەو رەشمارانە لا نەدەین مەڕي باشیان هەن بزانم یەك دوو سترە ماستان ناكڕن؟

لاندا و دانیشتین و ماستاوەكی خەستی مەڕیان لۆ هینابن, جا ماستاو بي هی مەڕي بي و لەبن رەشمارێ بی و بەهار بي و باران وە رەشمارێ كەوي دەبي چ لەزەتەكی هەبي؟؟!!!

والحاسر دەگەر ساحێب ماری كەتینە قسان,

وەزع و كوە؟

مارات سعری كوە؟

لەگەر باران و لەوەڕێ كون؟

ساحێب ماریش گۆتی خەركی كێندەرێن؟ هەر ئێكەو ناوی گوندی خۆن گـۆت , چیـوە , مێرگەسـەر. بالیسـان, كـانی بەرد, دیـار بـوو یەكـی لە گوندەكی دەناسی گۆتی فران كەس كوە ؟

گۆتیان گەلەكی نەخۆش بوو بردیتیانە ئێرانێ, مەعیدەی دێشا.

سـاحێب مـار گۆتی كو مەعیـدەی نایێشـي دەرێي بەرمیلێ زبـربە ئەوەی شـارەوانی لە پێش دوكانـانی دانێ, ئا بۆگەنی بـووە,هەرچی هەیە تێیـدەكا دەو ورگە بەستە زمانەی واللە چاكە ناتەڤي!!!

**** **** ****

*-وەستا باپیر گێڕایەوە گۆتی ساری ٢٠١٤ غەباتەم هەبوو لەو گوندانە بناغەم لۆ مزگەفتەکێ تێدەکرد,شیشیان دە عاردی چەقاندبوون لۆ نیشـــانەی و دەبـــا تـــا راســـتی ئەو شیشـــانە ســـەب و چیمەنتـــۆن تێکردبـــا,بەرام چیمەنتـــۆی زۆرە وبـــاو ئەمەش زۆرە بەتـــاروکە بـــوین ئیشـەکی دین لە گونـدەکی دی هەبـوو دەبـا چووبـاین,ئەمنیش یەك دوو چەکوچ لە شیشـاندا تـا بـڕەك دەعـاردیڕا بچـنە خـوارێ و زووتـر تەواو بین.

ئیشن تەواو کرد و بە مام حاجی قادرم گۆت کە سەرپەرشتی ئیشـەکەی دەکرد: گۆتم مام حـاجی لۆ سـەقف تێکردنێش لە خزمەتدامە و ان شـأ الله ئیشـەکی جوان و هەرزان و لۆ کەم ,

مام حاجی قادر گۆتی: خوا کەریمە لۆ سەقفی بزانم کوە بی!!

پاش یەك دو مانگان لۆ ئیشـەکی دیکەم رێ کەتەوە ئەو گوندەی دیتم ســـەقف تێکـــرایەو مزگەفـــت زۆری نەمـــایە تەواو بـــي !حـــاجی قـــادرم دیـتەوەو گـۆتم: مـام حـاجی ئەوە مزگەفـت خەریکە تەواو بي لەســـەر خێران؟ ئەدی قەول نەبوو ئەمن و سەقفي لۆ تێکەم ؟؟

مام حاجی قادر گۆتی: دیارە خوا نەیکردیتە قسمەت.

ئەمنیش گۆتم: دیارە قسمەت نەبووە بەس کێ سەقفی لۆ تێکردن؟

حاجی قادر گۆتی:وەستا سمۆی ئێزیدی.

ئەمنـیش گـۆتم: پەکـو لەو هەمـوو وەسـتا موسـورمانەی لـۆ بە غەیـرە دینان و تێکرد خۆ وەستای موسورمان نە براوون؟

حاجی قادر گۆتی: ئاخر جارێ وەستای غە یرە دین فێرە شیش داکوتانێ نەبووینە!!!

بەو خـــوایەی هەر کـــردمیە یەك قەتـــرە ئـــاو و لەو رۆژەـــــوە بە مسقالەکیش فێرێ ناکەم و تەمێ بووم.

**** **** ****

*-رەمەزانە چـارەگەکی مـایە لـۆ بـانگی مەغریبێ حوسـێن قومـان لە جغـارەیەدا و لاقی لەســەر لاقی دانـایە و ئـازاد و دلێـری کوڕیشـي دەستنوێژێ هەرەگرن لۆ مزگەفتێ خۆ حازرەکەن.

مـام رەحمانی بـابي حوسێنی لەسـەر قەلەوێرەی کەتیەو تاقەتی هیچی نـیە و ئـاخەکی هەرکێشـا و گـۆتی توخـوا حوسـێنکە شـەرمێ لە خـۆ نـاکەیەوە بەو ســەر و ردێـنە و بەو تەمەنەی بەرۆژی نـی ، دە هەر چـاو لەو کوڕانەت بکە یەك نوێژیش بێ جەماعەت ناکەن؟

حوسـێن گـۆتی: ئەهـا بـابە ئەمـن منـداری خـۆم باشـتر تەربـیەت دایـنە لەتوو،چاو لە کوڕي خۆ و کوڕێ من کە چەندیان فەرقە؟؟؟

**** **** ****

*-مامەندی وەگۆتە شێرۆی کوڕي سبیانێ دەچینە شەقراوێ مارێ خار جەلیلي،

شـێرۆی وەگۆ:ئـاخر بـابە ئیجـازەی مـسایەقیم تەواو بـووە دەترسـێم مەفرەزەی مروری بمگرن،

بابی گۆتی: کو ئیجازە تەواو نابي رۆژێ هەتا ئێوارێ بەو سەیارەی جرت و فرتتە لەو کۆرانی لۆ ئەو کۆرانی لەو گەڕەکی لۆ ئەو گەڕەکی.

**** **** ****

*-شـێرۆ دەیگۆ دەمەك بـوو حەزم لە ژنێ بـوو بەس نـاوێرام لەکن بـابم باسـکەم، دەمزانی لـۆم نـایێ چـونکە بـڕەك پارەی هەبـوو ئەویشي لـۆ حەجێ دانـابوو، زۆرم فکـر کـردەوە بە چ فێرەکی ئەو مەوزوعەی دەگەر باسـکەم ، بە داکـم گـۆت ئەوبـش گـۆتی جـارێ راوەسـتە، ئەمنـیش حەجمـانم نەمابوو لـۆ ژنێ، حـالۆری ببووم،ئـاخیری وەکی تێفکـریم بـابم پیـاوەکی زۆر بەدیـن و لە خـوا ترسـە پارەشـی لـۆ حەجێ خـڕ کـردیتەوە، گۆتم با بچم بەناوی دینی و نیمچە خوتبەکی رازی بکەم.

**** **** ****

چوومە کن بابم و گۆتم: السلام عليكم ورحمە الله و بركاتە

بابم گۆتی: و عليك

گۆتم :بابە بە خۆت دەزانی هەموو دەمرین و دەبي پێشی مردنێ باربووي لۆ قیامەتێ حازرکەین, ئەمنیش دەمەوێ تا نەمردیمە شتەکی لۆ پاش مردنێ حازرکەم.

بابم گۆتی: راست و رەوان برێ چت دەوێ ئەلعان؟

گۆتم: دەمەوێ نیوەکەی دی ئیمانم تەواو بکەم و ژنێم لۆ بینی.

بابم جرتەکی لێ بەردام و گۆتی: تڕ حێو نیوەی ئیمانت گەلەك تەواوە تا نیوەی دیت لۆ تەواو کەم؟ کوڕ هەی کافری مەلعون ئەتوو نە نوێژێ دەکەی نە رۆژیانەگری نەوەکی بەشەران تارەتێ کەی , جارێ ئەتوو هەڕوو نیوەی خۆت تەواوکە هەتا ئەمنیش نیوەی دیت لۆ تەواو کەم.

**** **** ****

*-رەحمەتی خوای لێبی( حەسەنە ڕسی بلەی) پیاوەك بوو، هەموو ژیانی نوکتەو قسەی خۆش بوون، پیاوەکی هەق و رەق بوو، لەسەر هەقی خۆی لەکەسی قبووڵ ناکرد، ئەوەی ستەم و غەدری لێکردبا ، دەبوایە تۆڵەی خۆی لێبکاتەوە، تائەو ساڵانەی دوایي هەرمابوو،

ئەیان گۆت جارەکێ هاتبووە توتمێ،مەغریبێ لەمزگەوتێ گوندی جەماعەتێ ئەکات،ئەو کاتی دیارە (مەلا ئەحمەدی باپیرم) پێش نوێژی کردووە،مام حسن بەو شێوەیە نیەتی نوێژی هینابوو:-

نـیەتم وێـیە ئەکەم نـوێژێ مەغریبێ لە مزگەفتی تـوتمێ،لەدوو مەلا ئەحمەدی ،الله اکبر.

*-جـاران بەرگ دروو کەم بـوون لە مەنتـیقەی،ئەوانەی هەش بـوون شـوێنیان دیـار بوو،وەکـوو خەیاتەکـانی گونـدی خەتێ و شـەقڵاوەو بێتـواتەو خەیـاتێکیش لە گونـدی(توتمەرەی هەرووتیـان هەبوو،نـاوی وەسـتا عبـدالله بوو)،سـەرەپاییزەو مـام حەسـەنە ریـس هەمـوو ئیش و کاری تەواو کردیە.سـەرو بەری جەژنیش بووە،سـواری هێسـترێ ئەبی و قوماشی هەرەگـری و ئەچیـتە لای وەسـتا عبداللهی،وەسـتاش سـەری قەرەبـالغ بـووەو بەمـام حەسـەنی گـۆتیە هەتـا حەفتەکی سـرەت بەرناکەوی،مام حەسەنیش ئەرێ:

زۆر باشــە ئەمــن لەگونــدی چ ئیشــم نەمـایە،توتنم رنــیەو ئیشــك بووە،پیـوازم هەرقەناندینە،هەرچی ئیشـە ئەم مایە،لێرە پارەدەمۆ هەتـا قاتەکەم لۆ تەواوەکەی،

وەسـتا عبـدالله تەماشـا ئەکات ئیـدارەدانی مـام حەسـەنی و هێسـتریش زۆری دەوێ،لەبەر هەنـدێ یەکسـەر دەسـت ئەکات بە دروینێ قـاتی مـام حەسەنی،لۆ پێشی عەسرێ تەواویەکات و ئەیداتەوە دەستی.

ئەوجا ئەیان گۆت مام حەسـەنی واگۆ(وەسـتا خۆماندی و شـەڤ مەکە مەکە گوناحە سـرە برپێم لـۆ مەکە). *-پاییزەکێ لەگەری بلەی خەریکی داوەشاندنێ گویزانە بی، سـەرووەختەکی لەدار گویزێ ئەکەویتە خوارێ، ئەوانەی لەوێن بەغاردانە چن و ئەبیتە هەرا مام حسن لەگویزێ کەتیە ،سـەرووەختەکی لەنـاو گـۆمە ئـاوێ دێـتە دەرێ و ئەچیـتە نـاو خەرکی و تەماشەی گویزێ کاو ئەرێ:

بەززاتێ خوای ئەو جۆتە گوێزانێهێم ئێ لەبیر چووینە.

*-گۆتیان سارەکێ لیژنەی سەر زمێری ئەچنە بلەی پێشی بگەنە گوندی ئەگەنە مام حەسەنی، دوای سەلام کردن، ئەرێن خارە ئەو گوندە چەند مارن؟

ئەویش ئەرێ :

لۆ زەلام کوشتنێ ئەرێن ، حەفت مارین.

بەرا لۆ پشکە خێرێ هەشتا مارین.

*-مام حەسەن زۆری جغرە ئەکێشان، ئەیان گۆ :

سبەینەکێ دار جغارەی دەدەستی دابوو، خەریك بوو لەناو گۆمەکێ خۆ شووشت:

ئەیگۆ: نیەتم وێیە غوسلێ ئەوێ پیرە کسۆکێ لەخۆدەرەکەم.

دار جغارەی دەدەستەکی دابوو، لایەکەی دی بن ئاوەکردو ئەوێ جارێ دار جغارەی ئەگواستۆ دەستی دی، ئەوێ جارێش نیوەکی دی بناوەکردۆ.

**** **** ****

*-حاجی عەلی بالیسانێ،بەرەحمەت بی ،مێوانێکی دێت،تورکمان بوو ناوی (مەمەد) بوو،دیارە معامەلەیان پێکەوە کردیە،وەکوو کڕینی تووتن و دار ئەسپیندار،بەڕێکەوت ئەو ڕۆژە (شیوی ماشیان) لێناوە،جاران ماش بەتایبەتی ئەگەر (قەرێي) تێدایە،ئەوا زیافەت بوو،دیارە مەمەدیش حەزی لێنەبووە،حاجی عەلیش کەتێر ماش دەخوات،ئەڵێ(الحمد لله خوایە،یارەبی لێت بەزیادبی) مەمەدیش ئەڵێ: عەلي ئەوا شوکرانەی لەسەر ماشي دەکەی؟ ئەمن کەفیل هەتا ئەتوو مابی ،خوا ماشت لێنابڕی.

**** **** ****

*-حەسەنی مام ڕەسوری مامسار گێڕایەوەو گۆتی:

ماری ئامۆزایەکم مەڕەکی زۆر یان هەبوو،چار پێنج مسەی بەوەجیشیان هەبوون،ئاغرەب شەوان گورگ بەناو مێگەلە مەڕی وەرەبوون،هەشت نۆ دەیەکیان ئەخنکاندن،ئەو سەیانەش (حەپپە) یان ناکرد.

هێوارەکێ مەلایەکیان ئەبیتە میوان،ئەوانیش حارو مەسەلەکەی لۆ مەلایە گێڕنەوە،مەلاش هەرەستی زاری گورگی ئەبەستی،کەسبەینە دادێ ،تەماشا کەن گورگ هەموو لەولای کەتینەو سەش لەولای و یەك مەڕیش چیە نەخنکێندرایە،

ئامۆزایەکەم هەمووی خڕ کردینۆ گۆتی خزمینە نسحەتەکێو لێکەم لەنۆپاش سەیان رامەگرن، بەس مەلایان راگرن،بەناوێ خوای مەلایەك سەد کسۆکی دینی.

**** **** ****

*-ئاخیری ساری هەشتاکان بوو خەرك زۆری یان جاش بوو یان فیرار یان عەسکەر،ئەمەش هەندەك خزمن هەبوون تێکڕا فیرار بوون ، شتاقیش ناوێران کاسبیەکی بکەن،ئەوجا لەگەر ئامر سریەکی جاشان رێك کەتبوون بە پارە بچنە رەبیەی ، هەم خۆیان دەپاراست و هەم کاسبیش بوو.

شەوەکی ئامر سریە هاتە رەبیەی و گۆتی : خزمینە ئەو یەك دوو شەوەی بڕەك هۆشیار بن دەرێن موخەریب هاتینە مەنتیقەی، لەناو جەماعەتێ بۆوە مقۆ مقۆ،

چ بکەین؟

کێ عایدی بیکەیسێ بي؟

چەند چەند حەرەسیاتی بگرن؟کێ عایدی ئارپیجي بي؟

کو تەوزیع بین؟

وه رێككەتن مام خدر ببیته عایدی ئار پیچي,و گۆتیان مام خدر وەکی ئارپێچي دەتەقینی ئاگات لێبي کەس لە پشتەوە نەبي,سەلیمیش بێ یەك و دوو گۆتی : ئەدی لە پێش؟

**** **** ****

*-کابانێ گێراوە وەیەگۆ تازە بووك بووم لەگەر خەسوێ سواری تەکسیەکی بووم لۆ بازاڕي,سایەق تەکسی ئاوێنەی دەگەر راست کردم چاوی لەسەر لانادام,

لەناکاو قاغەزەکی هەردا پشتەوە,ئەمنیش کاغەز هەردا کۆشێ خەسوێ وگۆتم : مامۆژن ئەها ئەو سایەقە رەقەمی لۆ هەردای ,

گۆتی خەسووم دەستی کردە جوینداێ حەیای کابرای برد و گۆتی : راگرە هەی کوڕی سەی هەی داك و بابت بە ك... کەرێ ئەوهەو ئەوهە لێکەم,

وەکی دابەزین خەسوێم وەگۆ: بەخوای جي دی چاوان رەش ناکەم با گوناح بار نەبم چونکی وەکی چاوان رەشەکەم پیاوما لۆ شێتەبن,..

**** **** ****

*- غەفوری حمەی کاك هەمزەی لۆی گێڕامەوە و گۆتی:

خزمەکن هێیە عاقری تەواو نیە،لەهەر مەدرسەکێ بی ئەو قسێ خۆ کـــات،رۆژەکێ مێـــوانن زۆر بـــوون لەمزگەفتـــێ جەمـــاعەتێ عەمرێیانەکرد،سـەر وەختەکی چـوونە سـوجدەی،کەیفی بیعـاقریش گۆتی :

هۆو ئەحە ئەحە،ئەوە لۆ ئاو خواردنەوێ حەیوانان بەکاردێ.

*- هەر کاك غەفوری گێڕاوە:

پیرەمێـردەکن هەیە زۆریشـی بەتەمەنە،بەرا دەگەر رۆژی گرتنـی زۆر دۆسـت نـیە،رەمەزان بوو،لەهـاوینێ،چوومە ماریـان ،لەنـاو بـاخچەی ئەوی ئاگـا لەمـن نەبوو،دیـار بـوو جغـارەیە کێشـا،دووکەرێ بەری عاسـمانێ گرتبـوو،ئەمن پێشـی وي چـوومە ماریـان ،پـارچە رایەخەکـم راێحسـت و لەسـەری دانیشـتم،ئەویش بەقادرمان وەسـەر کەت،گۆتم حاجی دەگە رەمەزانێ کووی؟

گـۆتی مەلا غەفـوور لەخـوای بەزیـاد بـی هەنـدی باشـم،الحمدلله نەتێنیەبم نەبرسي،لەوەی باشتر؟.

*-هەر کاك غەفووری گێڕاوەو گۆتی:

رۆژەکـێ گـۆتم دەبـا هەنـدەك خزمـان دەعـوەت بکەم،هەسـتام گیسکەکم سەربڕی و شیوەکە باشم کرد،زۆرلە خزمانم بانگ کرد.

ئێکی بەتەمەنـیش کەتبـووە لای من،هەنـدی خـوارد،ئەمن لەبـاتی وی شـەرم لەخۆ نەکێشاوە،وەختەکی تێربوو هەندی گۆشـت خوارد،خەریك

بـــوو خـــۆی لێکەکێشـــاوە،لەو وەختەـــدا دەنـــگەکە گەورەی لێوەهات،ئەمنیش گۆ ئۆ چ بوو فران؟

ئەویش گۆ :چنەبوو نا مانگا بوو لەبۆڕژنی دا.

**** **** ****

*-خزمەکن هەیە زۆری قسـە رەق و بلعـات پیس بوو (الحمدلله ئەلعـان بویتە پیـاو) رۆژەك دیتم لەپێش سـەیارەی بـابی دانیشـتیە لاقي دەگێچي گیرایە!

ئەمنیش گۆتم: خێرە ئەوە لاقت چ لێهاتیە؟

گۆتی: لە ئیشي بووم بلۆکەکم بەسەر لاقیدا بەربۆوە لاقما شکایە,

ئەمنیش گۆتم: الحمدلله مادام وەیە وەرن جەماعەت یەکەو ببسی و کێکەکی بخۆن لەسەر حسابي من بەو بۆنە خۆشەی,

ئەو خـزمەم لێ تـوڕە بـوو وەکی چـوومە ماریـان بە باشـی بەخێرهـاتن نەکردم,

داکی گـۆتی: کـوڕم ئەوە لـۆ ئەوهـا بە سـاردی بەخێرهـاتنی کـاك محمدی دەکەي ؟ عەیب ناکەی؟

گـۆتی: دایە واللە ئەگەر دەزانــی مەســەلە چـیە هەر لە مــارێ دەری دەکەی!

داکی گۆتی: لۆ جي کردیه تا له ماریّ ی دەرکەم؟ ئەویش لاقي شکاندبی هەر بەخێر بێ سەر چاوانم.

گۆتی: ئاخر دایه وەکی لاقم شکابوو له دوکانێ له خۆشیان شیرنی دەبەشیەوە.

داکی گۆتی: کاك محمد وەبوو ؟ ئەوەندەت رق لێبینەوە ؟

گۆتم: ئەرێ والله دەقاو دەق وەبوو شیرینم ئەبەشیەوە .

داکی گۆتی : جا لۆ؟ ئەدی ئەمە خزم و کەمی ئێکدی نین؟ چ خەرابەی توون هەیە؟ کو دەبي پێت خۆش بي کورِم لاقي بشکێ؟

گۆتم: ئاخر ئەو شیرنیه خێربوو تاخوا ئەو بلۆکەی بەسەر لاقیدا بەربویتەوە و بەسەری نەکەتیه دەنا ئەلعان دەبا له مزگەفتێ دانیشتباین نەك لێرە.

ئەوجا ما داکی دوعایان لۆ من بکات وقسان برێته کورِي لاق شکای.

**** **** ****

*-نیوەی شەوێ دوو سەیارە بەرانانی لێکیاندا و نەفەرەکانیان بردنە خەستەخانەی و هەموو کەل و کۆم ببوون، هات و هاواریان دەگەیشتە عاسمانێ، هەبوو لاقي شکابوو هەبوو دەست،هەبوو دەست و لاقي،هەبوو سەرو گوێلاکی دە خوینێدا شەلال ببوون، بەس پلکە خەج ساغ دەرچوو بوو،پۆلیسەك هات ئیفادەی وەرگری هێکان تاقەتی

قسان نەبوو بە ناچاری رووی دە خەجیجێ کرد و گۆتی: پورێ دەزانی ئەو دەعمە کوو بوو؟ ئەتوو کو ئاگات لێیە؟

پلکە خەج گۆتی: واللە نزانم کو بوو کو نەبوو بەس ئەوەندەی دەزانم غەرەزی قەدیمی بوو!!!!

پۆلیس: کو دەزانی غەرەزی قەدیمی بوو پورێ؟

پلکە خەج: چونکە هەر لە دوور ڕا چاویان لێك سۆرەکردنەوە!!!!

**** **** ****

*-شێخ عوسمانی (بلەی زۆری) بەرەحمەت بێ،گێڕایەوەو گۆتی:

ساڵێك مەلا خالیدی ئالانە لەخەلیفان بووە جیرانم،شەوێك زستان بوو، بارانەکی زۆر بە هێزی لێدەهات،بەتەنێ بووم لەمارێ، زۆرم حەز لەقسان بوو،کەس نەبوو قسانی لەگەر بکەم، سبەینی مەلا خالیدم دیت، پێم گۆت مەلا خالید شەوێ دی زۆرم حەز لەغەیبەتێ بوو، بەس بارانەکە هەند بەقووەتی لێدەهات درم نەهات بت نێرمە دوێ،مەلا خالیدیش(غەریقی رەحمەتی خوای بی) گۆتی (یاشێخ ئەدی ئەمە لۆچ جیرانین؟ئەدی وەکی هاتمە جیرانی توو پێم نەگۆتی ئەگەر مەسەلە هاتە سەر غەیبەتێ، ئەگەر باران بوو،بەفر بوو،تووڕداس ببارن،ئەگەر لەدووم نەنێري گەردەنێت ئازا ناکەم).

**** **** ****

*-گۆتیانە شێرۆی لۆ نەوەندە لە شەڕی دایم وەکی دوپشکێ کلکت لەسەر پشتێیە و لۆ شەڕی حازری؟

شێرۆ گۆتی : گوێم لێ بگرن جا بە خۆ حەکەم بن بزانن چ خەتای منی تێدایە ئیوها دەرچوویمە؟

مندار بووم مارمان هەر لە گوندی بوو لەگەر باوی چووبووینە داران لۆ شاخی هەورێ , وەختەکی دەنگی تەقەیەکی زۆر هات لەناو گوندی, بابم هەردوو دەستی برند کردن و رووي دە عاسمانێ کرد و گۆتی: بزنێ سۆرم خێرێ مەولودی پێغەمبەری بي شەڕ لە گوندی مە بي و دەگەرەمەش بي و تا دەچمەوەش خەلاس نەبي!!

**** **** ****

*-مام سابیری وەگۆتە حاجی قادری دەرێن لە شاری هەندەك جێ پەیدا بووینە پڕي ژن و کچن بە پارەت پشت و شان و ملان لۆ شێلن, دەتکەنەوە چاردە ساری نەرمتەکەنەوە, پێي دەرێن مەساج.

حاجی قاجری وەگۆ : سابیر بەخوای مەساجی کوردەواری گەلەك باشترە برێ لۆ؟

مام سابیر: لۆ؟

حاجی قادر: ئێك بە خۆڕاییە و لۆ ئەو وەزعە بێ پارەییەی زۆر گونجایە, دوایێ شەرعی و حەلالە و لەبەر ئەوەی نا مەحرەم ناتشێلن, ترسی مارێت نیە بە بێ منەتی پار دەدەیەوە, وەخت و جێي دیار نیە و بە کەیفێ خۆتە, ناچارت ناکەت خۆ رووت کەیەوە, منداریش بەکەلك

دێن و بە گەمەی تێدەگەن, کەس شك و گومانی خرابت لێ ناکات و زەرەری نیە لۆ سەر سومعە و شەخسیاتت, رەسەنایەتی تێدایە و گەڕانەوەیە لۆ فۆلکلۆر و پشتاو پشت لە باب و باپیرانن لۆ بەجێ مایە, ناشترسێی تومێی چ نەخۆشێی و دەردان بیێ,پاش تەواو بوونی شێلانێش دەتوانی هەر لە جێی خۆ ئیسراحەت بکەی و بنوی بە عەکسی مەساج خانەی هەروەکی تەواو بووی وەدەرێتەنێن!!!

**** **** ****

*-عەیزە گۆجی تومێ ، پیاوەك بوو زۆری رەزیل بوو،هەتا مردیش ژنی نەینا،ئیشی هەر شوانەتی بوو،لەحەفتایەکان ماریێ حمدامینی برازای حوکمەت بردنیەدیوانیەی ،هاوێن داهات و مام عەزیز گۆتی باسەردانەکی حمدامینی برازا بکەم، هەرستا وەرێکەت ، هەرکووەکی هەبوو،گەیشتەدیوانیەی ماری دیتنەوە، منداریێ حمدامینیش لەخۆشیان ،دەستیان بەهاوارهاوارکردنێ کرد(هەی مام هات ، مام هات) مام عەزیزیش هێشتا بەتەواوەتی لەترومبێلێ نەهاتبووە خواریێ، گۆتبووی (چ ما مام بەتڕان هاتیە؟ شەشە دینارم سەرف کردینە).

*-دوای ئەوەی مام عەزیز گەیشتە دیوانیەی و چەند رۆژەك بوو لەوێ بوو ،حمدامینی برازای لەگەر (صابیری حاجی سمایلی) مام عەزیزی ئەبەنە بازاڕی ،هەردووکیان تەگبیرەکێ ئەکەن ،ئەرێن ئەیبەینە مەتعەمەکی و ئەمە زوو نانیەخۆین و زوو دێینە دەرێ ،وەبی مام عەزیز پارەکەی بدات، پێش ئەوەی بچنە مەتعەمی حمدامین پێراوەکی بە مێ

دینــارانە کــڕی و لەنــاو حەلــلاگەی دائەنــێ و ئەچــنە مەتعەمــی ، دەســتەکەن بەنــان خــواردن و ئەوان زوو نــانیەخۆن و دێــنە دەرێ و بەســاحێبی مەتعەمیشــەرێن پــارەی خــواردنەکەی لەو پیرەمێــردەی وەرگــرە، لەتەنگاویــان پێراویــان لەبیرەحی، مــام عەزیــزیش بەکــاوەخۆ نــانیەخوا و دەستانەشــواو خەریــکە بچیــتە دەرێ ســاحێبەکەی ئەرێ وەرە پارەکەی بدە، ئەویش پێراوی لەسەر مێزێ دائەنێ،ئەرێتە ساحێب مەتعەمــی وەکــی هــاتنۆ دوای پێــراوی پارەکەیــان لێــوەرگرە،ئەوانیش لەدەرێ چاوەڕێیەکەن لەو بەری جاددەی پێي پێکەنن ،مام عەزیزیش ئەرێ (ئۆ بەمن پێکەنن ؟ هەڕوون پێراوی بیننۆ،قوونم گان قوون).

*- مــام عزیــز کەشــوانەتی ئەکــرد ، یەکەم مەرجی ئەوە بــوو ئەیگــۆت (ئەمن مانگێ رەمەزانێ شوانەتێ ناکەم).

ئیدی وەختی رەمەزان دادەهات ،جلکۆکەی لەناو (بوخچە) کێ ئەنان و بەپیلی دائەدا ، لێیــانە پرسي ،کێــوە مــام عزیــز؟ ئەیگــۆت ئەچــمە لای بەستۆڕێ ،هەمان دەبن بەردانەنێم،مەخسەدی رۆژی بوون.

*-ئەیــان گێڕایەوە کاتێ کەمــام عزیــز بەبەغدایێــدا تێــپەڕ بــووە، بەپێش مەکتەبەکێدا تێپەڕیوە،دیارە مەکتەبەکە سەرەتایي بووە،منداڵی زۆری لێهــاتینە دەرێ،ئەو وەتێگەیــي یە ئەوە ماڵە،ئەوجــا ئەیگێــڕاوەو ئەي گۆت،بەپێش مارەکێدا تێپەڕیم هەندی منداره هووردکە لێهاتنە دەرێ ،نزانم ئۆ کوو داکیان لێك هەرنەزڕایە..

**** **** ****

*-ساری ١٩٩٤بوو ١٩ ساری بووم لەناو دەلال خانەی هەولێریێ لە پێش دوکانێ ئیسماعیل تیماری وەکی زۆر خەرکی دی دەرمانم دەفرۆشت, نزیکی مەغریبێ بوو زەلامەکی چارشانەی بە چەك و تاقمەوە هات و دەستی گرتم و گۆتی : کورە ئەوە لۆ دەرمانی دەفرۆشی نزانی مەمنوعە؟

زۆری لەبەر پاڕامەوە هەتا بەرمدا کەلکی نەبوو! ئاخیری گۆتی: بەرت دەدەم بەو مەرجەی پارچە حەبەکی خەوێ ظالیۆم رەقەم ١٠ی عێراقیم لۆ بینی,ئەو نەوعە حەبانەش لۆ سەرخۆشیێ دەخوران و زۆر خەتەر و پیس بوون ئەمنیش نەمدەفرۆشتن, بەس چارەم نەبوو.

گۆتم:باشە کاکە لۆت دینم بەس بشمکوژی هەتا پێم نەرێ ي لۆ چتە ناندەمێ,زۆری وەگۆ ئەتوو حەقت چیە لۆم بینە و ئەە,

گۆتم:نابی دەبي هەر بزانم بەخوای.

گۆتی: کاکە ئەمن حەز لە کچەکی دەکەم و ئەو حەبانەم لۆ مارێ ئەو کچەیە تا لۆ مارێ دە ماستاوێ کات و بنون و ئەمنیش خۆ بگەینمە کچەی.

زۆرم قالب تێك چوو و پێم گۆت کاکە ١٠ ملگرامیم نین ٥ـم هەن دەبي؟

گۆتی فەرق چیە دوو پارچانە بەم وەکی یەکە؟

گۆتم: چ فەرق نیە,تەواوە.

چووم دوو پارچە حەبي لاكسدیلی ٥ ملیگرامیم لۆ هینان و گۆتم ها، بەس گۆتم دەبي هەردوو پارچان تێکا، کابرا زەردە خەنەکی کرد و رۆیشت.

سبیانێ وەکی چوومەوە دەلال خانەی دیتم کابرا لەوێ چاوەڕێي من دەکا و ئاگری لە چاوان دەباری، کە چاوی وێکەتم گۆتی: هەی هەتیمی حەرامزادە ئەو بەزمەت لۆ بەمن کرد و حەیاو ناموست بردم؟ تفەنگی لە پیلی هیناخوارێ و خەرکن لێ خڕ بۆوە گۆتیان چیە کاکە ؟

کابرا گۆتی: ئەو ناجسنە حەبی دایمێ عەلەساس هی خەوێن بەس هی زکچونێ بوون و تا سبیانێ لە ڕێي ئاودەستێ بووم !

گۆتیان: برا چ وێناچی! رەنگت جوان دیارە و سعاتەك دەبی لێرەی چمان نەدی بچیە عەدەبخانەی؟

گۆتی: ئاخر لۆ خۆم نەبوو،

دوایێ گۆتی: کەسی دەرمانفرۆشي شارەزای لێیە تەماشایەکی ئەو قالکە حەبەم لۆ بکات بزانم هی چیە؟

برادەرەك هات و گۆتی: هي خەوێ یە بەس ٥ ملیگرامە.

کابرا قەناعەتی هات و پیلی گرتم و گۆتی: باشە ئەدی لۆ زکچوویان پێگرت؟

گۆتم: کا لۆم باسکە بزانم چ بووەو کوی داینێ؟

گۆتی مەغربێ حەبم وە کچەکەی دان و بەخۆشم سعات ٩ی شەوێ خۆم هەردا مارێیان و خۆم لەبن قادرمەی شاردەوە هەتا دەنون، بەس

کەسیان نەنوستن و هەتا مەلای سبەینێش بانگی دا ئەو مارە تێکرا هەر هاتوو چۆی عەدەبخانەیان دەکرد.

پێکەنینم دەهات بەس ناشوێرام پێبکەنم و گۆتم: کاکە ئەوە هەبی و نەبی ئەو کچە خوێی دەناو ماستاوێ کردیە و خوێ و ئەو حەبەش عەکسی ئێکدین و زەلام پێ توشی تەسەمومی دەبي،

گۆتی: والله لەوانەیە وەبی.

گۆتم دوو پارچەی دیت لۆ بینم ئەو شەویش بچیەوە؟

گۆتی : نا کاکە تۆبە, گەلەکم خەو دێ خەریکە لۆ خەوێ شێت بم دەچم برەك دەنوم.

تێبینی: حەبي لاکسدیل یان( بیزاکۆدیل) باشترین و بەهێزترین حەبي رەوانی بوو ئەو وەختی یاعنی لۆ قەبزی بەکاردێت و ظالیۆمیش( دیازیپام) وەك حەبەکی هێورکەرەوە بەکار دێت و کەسەکە خەوی پێ دێت.

**** **** ****

*- حاجی قادری خار فەقێ عزیزی،بەرەحمەتێ بي زۆری قسە خۆش بوو،کەرەکی هەبوو،کەرێ بەستەزمانیش (کەسمە) ی هاتبوون،خەریك بوون کەسمەیان دەردینان،کسۆکەکیشی هەبوو،کسۆکیش هەرلەدەورەی هەرەپەڕي،سەروەختەکی حاجی قادری لێ تووڕە بوو،پێلەقەکی لەکسۆکی دا ،گۆتیێ،وەڵلاهی دەبن خۆرێي نێم لێناگەڕێم بیخۆی.

*-حـاجی قـادر چـاوبە تەواو نەبـوون،خێلە بوو،سـاڵی ٩٢ بەفرەکی زۆر کەتبوو،ئەو خەرکە رۆژانە نەچوونە راوە کەوێ،حاجی قادرِش تفەنگێ لەخۆ قەیمە کات و هەورازە چی لۆلاي کەونە گوندی،لەرێێ مام یاسین کە خاری حاجی قادری بوو ئەیگاتێ ،ئەرێ ئۆکێواچی خوارزا؟

ئەویش ئەرێ وەڵلاهی خارە بەتەمامە بچمە راوێ.

مام یاسینیش ئەرێ ،خـوارزا ئەتوو و راوبان نەگۆتیە،وەرە هەڕوو چێرم بەستیتۆ،هەڕو یەك سریەی بگرێ ،ئەگەر لێت دا ئۆ چێریشت لۆخۆ،

ئیدی حاجی قادر بەبێدەنگی ئەگەڕێتۆوە مارێ.

**** **** ****

*-مام قادری بابی حەمەقادری هەرمکێ دەگەر مام عەلی چیوێ پێکەوە لەناو عاردان دەبن و خەریکی شینايي ئاودانێ دەبن.

مام عەلی دەرێتە مام قادری: قادر برۆ گندۆرەکی بینە تا بخۆین

مام قادرِش لەبن سیبەرێ پار دایتەوە دەرێ: واللە ناچم ,

مـام عەلی بەخـۆ دەچی گنـدۆرەکی دینی و سـپی دەکـات و وردە وردە دەیخوات, وەکی تەواو دەبی پەلکە گندۆرەی لەسـەر سینگی مـام قـادری دادەنێ , ئەو وەختیش فەقیری بـووە بەس کورتەك یـان کراسـەکی سپی هەبـووە لەبەر کەن و سـینگ هی رووت بـووە,بە نەرمی دەرێ قـادر نەجـولێي مـارەکی بـۆرەت لەسـەر سـینگیە بجـولێي پێـت وادا, خێرەکێ لە خـۆ بـکە و ئەمنـیش بە تەمـای خـوای دۆرەمەڕەکێي وەبەر هەرەدەم و

وەدووری دێخـم، مـام قـادر دەرێ خـوایە مێنگـوینێ سـۆرم خێر بێ ئەو مارەم پێوە نەدا، هەر ئەو مینگوینەشی هەبووە، مام عەلی دۆرەمەڕەکێ وەبەر پەلـکە گنـدۆرەی هەرەدا و فـرەیەداو غـاریەداتێ و یەك دوو دۆرە مەڕان لە عـاردیەدا دەرێ واللە بـزر بـوو مـاری کـافر، مـام قـادر گەلەك شوکرانێ خوایەکات و سبەینێ مێنگوینێ سۆر دەکاتە خێر، پاشی ماوەکێ دوپشکەك بە مستەفای کوڕی مام عەلی وادات ، مام عەلی زۆرە ترمێ دەرێ بەخـوای تـۆرێ قـادرم لێبـۆوە لە ترسـان ئەویش دەرێ خـوایە بزنێ گەورەم خێر بێ مسـتەفای چ لێنێ، والحاسـل مسـتەفا چـاکە بیـتەوە و مـام عەلـیش بزنـێ دەکـاتە خێر و رانەکی لـۆ مـام قـادری دینی و دەرێ گەردەنێم ئازاکە .

**** **** ****

*-حەمە قادر موالیدی عەسکەرێ هـاتبوو و نەچوبۆ پێش، شـورتە لە هەرتەلێ ڕا بەدویدا هاتبوون و و بانگیەکەن و ئەویش هەردێ شـوڕتە بە هێسـترێ ئەویش بە پێیـان ، وەختەکی حەمە قـادر لە شـوڕتان بـزرە بی، بـاش چـاوەش وارێ بەس بەو زەلامەی بـرێن بێـتەوە بـزانم کـو بە پێیـان لەبەرەمە دەرباز بوو وەعد بی عەفویەکەم .

**** **** ****

*-وەختی شۆرشی ئەیلولی خەرك هەموو ببووە پێشمەرگە و ئەوەی پێشمەرگەش نەبا چەکدار بوو, لەو گوندانەی لای خۆشن گەنجەك لە شوانەتی بێزار ببوو حەزی دەکرد ببیتە پێشمەرگە,بەس بابی رازی نابوو,

بابی چووە کن سەر لقی و بزنەکی لۆ برد و گۆتی: ئەگەر بایزی کوڕم هات مەیکەنە پێشمەرگە, بێ شوانەبم و بەخۆش پیرو شەکەتم و ماراتم پێ بەخێو ناکرێ.

رۆژەکی بایز لە مەقەڕی وەژۆرێ کەت و گۆتی: هاتیمە بمکەنە پێشمەرگە.

سەر لق گۆتی: ناوت چیە و خەرکی کێندەری؟

بایزی ناو ونیشانی خۆ گۆ, سەر لقي وەگۆ: بە خوای کوڕێژگە ئەتوو بەکەلك پێشمەرگایەتێ نایەی هەڕۆوە ماری.

بایز : لۆ بەکەلك نایەم؟

سەر لق: ئاخر نزانی شەڕی بکەی لۆیە.

بایز:ئەتوو کو دەزانی نزانم شەڕی بکەم خۆ تاقیت نەکردیمەوە؟

سەر لق: دەی ئەوە گۆتمان شەڕەو لەناو سەنگەرێدای دوژمنت لۆ هات چ دەکەی ؟

بایز: تەقەی دەکەم .

سەر لق:ئەدی ئەگەر لە تەقەی نەگەڕاوە؟

بایز: تەقەی زیاتری لێ دەکەم هەتا دەیکوژم.

سەر لق : ئەدی ئەگەر نەکوژرا و هاتە ناوسەنگەرێ؟

بایز: دەیکوژم.

سەر لق: ئەدی ئەگەر ئەو ئەتووی کوشت؟

بایز: واللە بزانم دەمکوژی راست هەردێم.

سەر لق: ئەدی کورم ئەمن چ گۆ؟ مادام هەربێ ي بەکەلك پێشمەگایەتی نایەی لۆخۆ هەرۆوە مارێ.

**** **** ****

*-مەلا ئەبوبەکری شەرکان ،هەزار رەحمەتی لێبی،مەلایەکی تابلێي باش و بەتەقوا،عادەتی وابوو،لەهەر شوێنێك بایە کە کاتی بانگدان بایە،ئەوا لەو جێیە دەستی بەبانگدان دەکرد،گەلەك جار لەماڵەوە بووەو کاتی بانگدان بووە،هەرلە ماڵێوە دەستی بەبانگدان دەکرد،هەربەرێوە بانگي ئەدا ،لەنێو برگەکانی بانگدا،ئەگەیشتە هەرکەسێك سەلامی لێدەکردو،ئەگەیشتە گاوانی ئەیگۆتە گاوانی ئۆلۆ چێرێمە نەهاتیتۆ؟

یان ئەیگۆتە مام سلیمانی ،ئەرێ کیلۆ چایەکەت لۆ هینام مام سلیمان؟.

**** **** ****

*-مامەندی وەگۆ: منداری ئەلعان وڵاتی کاولەکەن.

بایزی وەگۆ: لۆ ئۆباو چنکردیە هەتا دنیایێ خەراب کەین؟

مامەندی وەگۆ: ئێ کورم ئەتوو بەخۆ جغاران لە عەدەبخانەیا کێشي و میزێ بە دیواری داکەی !! لەوەی خراپتر چ؟؟؟؟

**** **** ****

*-رەحمەتی یاسینی حاجی حەسەنی گێڕایەوەو گۆتی:-

لەبازاڕی شێخەڵلای توتنمە فرۆشت،تووتنەکەش هەتا برێي تووتنەکی خەراب بوو،رۆژەکێ کابرایەك هاتەلام پێدەچوو خەڵکی باڵەکایەتێ بي،هات سەلامی کردو دانیشت و گۆتی تووتن بەچەندیە؟ئەمنیش گۆتم بە پێنج دینارانە..

کیسەکەی تووتنێي لەباخەڵێ هینا دەرێ و لە کیسەکەی خۆی جغارەکی تێکردو پێی کردو یەك دوو قومی لێدان،گۆتی وەڵلاهي تووتنەکە خۆشە،دە دوو کیلۆیانم لۆ بکێشە،

**** **** ****

*-مەغریبەکی لە شکارتەی دەگەڕامەوە ماری پیرەمێردەك لە مەفرەقی ڕاوەستا بوو ئەمنیش سەیارەم لۆ ڕاگرت, گۆتم گەرمایە و گوناحە.

کە پیرەمێرد سواری سەیارەی بوو سەیارەی دەست بە توتە توتێ کرد,

پیرەمێردی وەگۆ: ئەوە چیە ئەو توتە توتە خۆ ترومبێلت خەرانەبووە؟

ئەمنیش وەگۆ: ناوالله چ عەیبی نیە, بەس ئەو توتە توتەی دەگەرەمەیە دەرێ خۆ ببەستنەوە.

پیرەمێردی وەگۆ: بە خوای ترومبێلەکی بێ عاقرە.

گۆتم: لۆ؟

گۆتی: کوڕە ئەدی!!!! سەدام کیمیایی لێداین بەقسێن نەکرد ئەو ناسنەوارە بە هەموو عاقری خۆ دەیەوێ بە توتو توتێ ی بە قسێ بکەین؟؟؟؟

**** **** ****

*-حاجی ڕەشیدی عەولای تەهای گێڕایەوەو گۆتی:

ساڵی حەفتاکان خانیم نوێ کردەوە،هاوین بوو ،دوو هێسترم هەبوون،مانگەشەو بوو،بەتەمابووم بەیانی زوو بڕۆم بچمە چیای دوو بارە چروان بینم،خەوم لێکەت،داخوا لەسەر زەین نووستبووم،وەختەکی بەخەبەر هاتم وەمزانی بەیانە،هەرستام هێسترم کورتان کردن و چوومە مزگەوتێ نوێژم کردوو بەڕێکەتم،چووم دووبارە چرۆم هینان،سەیرم کرد شەو هەرووەکی خۆیە،ئەوێجارێش چووم نوێژم کردەوەو بەڕێکەتمۆ،بەهەمان شێوە دووبارە چرۆی دیکەشم

هینان،دیسان شەو هەر وەکی خۆبوو،ئەوێجارێشم نوێژ کردۆوەو بەرێکەتمۆ،ئەوێجارێ خەریکی چرءۆ بڕینێ بووم،گوێم لەبانگی گوندی شێخوەسانان بوو،ئەوێ شەوێ شەشە بارە چرۆم هینان و چار نوێژیشم کردن.

**** **** ****

*-هەر حاجی رەشید گێڕایەوەو گۆتی:-

سەرەتای پایزێ بوو،ئێواری چوومە بالوکاوێ،حاجی مستەفای مام یەحیای ئامۆزا ئێزنی نەدام ،نانم لەوێ خوارد،سعات یازدەی شەوێ خوا حافیزیم کردوبەڕێکەتم،چووم بەناو باخچاندا گەڕامەوە،

گەیشتمە سەرچیلێ عاردی مارێ فەقێ عەیزی کاني بێرێ،دەعبایەکی گەورە لە پێشم راوەستایە،رووح لەجێیەکی قەیمی نایێتە دەرێ ،زۆر ترسام،سەتا سەت دامنابوو کەئەوە هەرسە،

خێرا خۆم لێلادا و رۆیشتم،تەماشەم کردێ،ئەویش لەدوای منە،

ئەوێ جارێ زیاترم هێزدا بەرەخۆ،سەیرم کرد هەرلەدوومە،گەیشتمە سەر کانیێ شێخارەی ،ئەمن گەیشتمە سەر چیلێ بەردەکی پڕ بە چەنگی کەتە ناو دەستانم،تەماشەم کرد،ئەویش خەریك بوو لە جۆگێ بپەڕێتۆ،هەتا هێزم تێدابوو،بەردم راوەشاند،بەرد لۆ ناحێ لەتۆق سەرم داو بۆرَژنی لێهات ،سەیرەکەم گۆلکە.

**** **** ****

*-بایزی کەر تۆپی بوو گۆتیان لە فرانە گوندی کوێخای گوندی کەرەکی باشی هەیە و دەیفرۆشی،

بایز چووە گوندی و دیتی خەرکەکی زۆر لەبن دیواری مزگەفتێ دانیشتینە، سەلامی کرد و گۆتی: ئەرێ خزمینە مارێ کوێخای گوندی لە کێندەرە؟

پیرە پیاوەك وەجواب هات و گۆتی: واللە براله لەوسەری گوندیە، ئەمنت دەگەر دێم پێشانت دەدەم، پیرە پیاو وەپێش بایزی کەت هوردە هوردە دەرۆیی،بە شەکە شەك گەیشتنە مارێ کوێخای، بایز لە کیژۆرەکی بەر دەر کەی پرمی گۆتی: مام کوێخا لە مارێیە؟

کیژۆرە گۆتی: ناواللە.

بایز گۆتی: ئەدی دەبی لە کێندەر بی کوێخا؟

پیرە پیاوەکە هەربدایێ و گۆتی: واللە براله کوێخا وا لەبن دیواری مزگەفتێ دانیشتیە!!

بایز: ئەدی چما وەتنەگۆ ئەو هەموو رێیەت بەمە بری؟

پیرە پیاو: چما ئەتوو وەگۆ کوێخا لە کێندەرە یان مارێ کوێخای؟

**** **** ****

*-عوسمانی مام سەعدی بالوکاویٚ لۆی گێڕامەوەو گۆتی:

دەرکەی مزگەوتـــێ بالوکـــاویٚ یەك کلیلـــی هەبـــوو،دەرکەکە دار بـــوو،بەدۆریخ دائەخـــرا،کلیلەکەی دار بوو،لەجێگـــایەکی دەرەوەی مزگەوت دا ئەنرا،تەنها (مام سەعدی و محمدی مەلا خدری) کلیلەکەیان پێئەزانی،ئێـوارەیەك دوو بـرادەری مـام سـەعدی پەیـدابوون،عەرەب بوون و بەچەفیەو عەگالەوەو جلکێ عارەبان هاتنە مارێ مە، بابیشـم زۆری بەخێر هینان،هەتا درەنگی شەوێ مەدریسیان داناو،لۆ نووستنێ ئـاغي بـوون گۆتیـان ئەچیـنە مزگەوتـێ و لەوێ ئەنووین،هەرچەنـدی لەگەرن کردن،گۆتیـان هەردەچین،خـۆ جـارانیش کـیهە مـاڵی گەورەبـوو تەنهـا دوو ژووریـان هەبوون،وەلحاسـر لێـف و بـالیفن لـۆ هەرگـرتن و بـردنە مزگەوتێ و دوایي دەرگان لەسـەر داخسـتن و کلیلیشـن لە شـوێنی دیاریکرای دانا،

بەیانی وەکوو عـادەتی جاران (محمدی مەلا خـدری)زوو ئەچیتە مزگەوتێ دەســتنوێژێ هەرەگــری و دەســتەکاتە کلیلــێ و دەرگــای مزگەوتـــێ ئەکـاتەوە،بەبێ ئەوەی ئاگـاداربی کەکەسـي لێیە،تەماشـا ئەکـات دوو زەلامـــی عەرەبـــی گەورە لە مـــزگەوتێنەو هەر زوو ئەچـــی دەســـتیان ماچەکات و ئەڵێـتە ئێکەکیـان (یارسـول اللە،ئەوەی دەگەرت دایە ئەوە ئیمامی ئەبوبەکرە یان ئیمامی عوممەرە؟).

**** **** ****

*-پوره شەم دەردە ری خۆی لۆ زاریێ باس دەکات و دەریێ: کورم دەگەرە خـرابن بـوکم دەگەرە خـرابن ئە نەخۆشـم و دینـارەکم وێنـیە بچـمە دختـۆریش، هـۆر هۆریشـە گریێ، فرمێسـکی بە چاوانـدا دێـنە خـواریێ، زارێش گوێ خۆی لۆ قولاغ کردینە و زەینی خۆی دایێ .

وەکی شەم لە دەردە دری خۆ تەواو بوو گۆتی: ها زاریێ ئەتو چارێی؟

زاریێ وەگۆ: ماشـاْ الله شـەمێ سـعاتەکە دەگریێی و کلـت لە چـاوان نەبویتەوە؟ پێم ناریێ ی ئەو کلەت لە کێندەریێ بوو؟

**** **** ****

*-عوسـمانی واگـۆ: تـازە ژنـم هینـابوو پەترۆلەکی علـوجم هەبـوو، خەزووری تەلەفۆن لـۆ کـردم گـۆتی سـەیارەی بیـنە تـابچین هەنـدەك شمەك و حاجەتان لۆ ماریێ بکرین.

عوسمان گۆتی خەنی بووم یەکەو سەر گەیشتمە پێش ماریێ خەزووری و یەك دوو هۆرنەشم لێدان هەتا خەرکم ببینی.

خەزوورم سـواری سـەیاریێ بـوو قـۆري دەجـامی پێشـێدا هینـانە دەریێ و چـوینە دوکانێ سـەلاحی و خەزوورم سـعری شـمەکی پرسی و سـعری بە دری نەبـوون و گـۆتی زۆر گـرانن بـا بچیـنە حاجیـاوای، کەتیـنە رێێ لـۆ حاجیـاوای بە چـوون و هـاتنەوەی سـعاتەکن پێچـوو ، شـتێ کـری وخەزوورم گـۆتی عوسـمان وەرە راسـت لـۆ دوکـانێ سـەلاحی، چـوینە دوکانێ سەلاحی وەمزانی شتی زیاتری دەویێ.

که گەیشتینە دوکانێ خەزوورم گۆتی سەلاح هەی کافری بێ دین دەزانی ئەو سعرەی تـوو دەگەر حاجیاوای شەش هەزاری زیاتر بوو؟ ئەتوو لەخوای ناترسێي؟مردن هەیە مردن!!!!

سەلاحی وەگۆ: مام حاجی لۆ لە زاوای تەرو تازی ناپرمي بزانی بایێ چەند شەش هەزاریانی بەنزین دە پەترۆلێ کردیە؟

**** **** ****

*-لەگوندی خەتێ ،ئاشەکی ئاوی لێ بوو،ئاشەکە ئي (مەلا محمود)ی بوو،ئەیان گۆت زستانەکێ ئەبیتە باران و لافاو ،لافاو بەسەر ئاشي دەگەرێ ،ئەویش ئەچی ئاوێ لەسەر (قۆتەراشێ) لاببا،فانۆسۆکەکە خەرابوچکۆکەی هەبوو،فانۆسي لێئەکوژێتەوەو ئاویشی بەسەر قۆتەراشێ ئەکەوێ،بەخۆ بەپیرەژنێ ئەبن،گۆتیان ئەیگۆت(بەخوای وابزانم مشاوەشي پەیدا بی)

*-هەرلە گوندی خەتێ،کابرایەکی (گا) یەك هەبووە،بەتەمابووە بیفرۆشي ،ئیدی مشتەریشي زۆر ئەچنە سەری،لۆ وراغ کرینێ جاران تەماشەی ددانانیانەکردن،مەزانە هەند مشتەری چووبوونە سەرێ ،هەندیان دەو لێك کردبۆوە،ئەیانگۆت گایەکەی چاوی وەهەر زەلامەکی کەتبایە،دەوی خۆی لێکەکردۆ،وەیەزانی مشتەریە.

**** **** ****

*-حـاجی تـۆفیقی تەراق خواردبـوون چیـدي جفـاران نەکێشـی، لـۆ جفارانیش شێت ببوو تازەش تەراقی خواردینە ناکرێ پەشیمان وەبی،

رۆژەکی چرقەی گەرمایێ حـاجی تۆفیـق لەسـەر جـۆخینێ بـوو مانـدی و شـەکەت ئـارەقەی لە پێراوانـدا داتە دەرێ , بـایز لە دووری ڕا هـات بە هـاوار کـردن ئەی هـاوار مـام حـاجی تۆفیـق وەی هاوارمـام حـاجی تۆفیق!!!!!

حـاجی تۆفیـق گـۆتی : چـیە کـوڕە بـایزۆك ئەو هـات و هـاوارەت لە چـیە دنیات تێگەیاندیە چ بووە؟

بـایزی وەگـۆ: چـت لێ بشـارمەوە مـام حـاجی واللە پلـکە هەمینێ خێزانـت لەسەر بانی بەربۆوەو مێشکی پرژا و مرد؟

حاجی تۆفیقی وەگۆ: بایزۆك تاکیدی هەمین مرد؟

بایزی وەگۆ: ئەرێ واللە خوا عافوی کات .

حـاجی تـۆفیقی وەگـۆ مادام وەیە دای کیسـەم وێدە بـا جفـارەکی تـێکەم خۆ ئەمن وەزگدا لۆ جفارەکی , چانەبوو ئەو تەراقەم لەکۆر بۆوە!!!!!

**** **** ****

*-مام پیرۆت رۆژەك پێشی رەمەزانێ وەفاتی کرد،خەرك زۆریان پەرۆش بوو چونکە پیاوەکی باش و لەخوا ترس بوو، پلکە خانزادي گەلەك لۆ گریا دەیگۆ: ئاخ مام پیرۆت رۆیشتی و خێرو خۆشیێ ئەو رەمەزانەت وەبەر نەکەتن!

پلکە شەمێ وەگۆتێ: کچێ خێر و خۆشیێ چ؟ واللە ئیسراحەتی کرد لۆ خۆ!! خانێ ئەتوو لۆ حاری خۆ بگریێ دەبي ۳۰ قوتە رۆژان لۆ قومە ئاوەکێ وەزگ دەی!

**** **** ****

*- مەلای لە خوتبەی گۆتی : ئەوانە رۆژی لەسەر نینە و خوای گەورە ئیجازەی داینە بەرۆژی نەبن:

ئێك: ئەوانەی نەخۆشن و بە رۆژیان تێکەچن.

دوو: ژنی حامیلە.

سێ: موسافیر و رێبوار

ئەوجا مام کەمال هەموو رۆژان لۆ شفتیەکی یان دوو کیلۆ تەماتەو گندۆران یان لۆ کیلۆ ترشیاتەکی دەچۆوە هەولێرێ دەیگۆ موسافیرم و رۆژیم لەسەر نینە!!

**** **** ****

*-وەسمانی وەگۆ: مامەند دەزانی نانی جۆی چەند بە ئیستیفادەیە؟ دەرێن لۆ سوکەری و زەخت و نەخۆشي دری و لۆ قەبزي و چرچ و لۆچێ دم و چاوان و ئێسکان ئێکاو ئێکە؟

مامەندی وەگۆ: والله وەسمان هەندت مەدحی جۆی کرد شەیتانا وارێ هەرۆ دمی دە جۆرکی جۆی نێ!

**** **** ****

*-شێرزادی واگۆ: ساری نەوەدەکان بوو خەرك فەقیر بوو جلك و پێراو زۆر کم بوون خەرك قاتی کوردی وەردەگێرا و پێراوی بن لێدەنانەوەو پینەیە کردن،

گۆتی خزمەکمان هەبوو لە گوندی تازە خیندنی مەلایەتی تەواو کردبوو بابی ژنی لۆ دینا، ئەمنیش تازە گەنج بووم کراشەکم کڕبوو سەرو مارم هەر ئەو کراشە بوو،تازە مەلا و تازە زاوا داوای کراشی لێکردم لۆ رۆژی ژن گواستنەوەی ئەمنیش بە ناچاری وێمدا.

نیوڕانێ نان خورا و بووك هات و مەلام دیت کراشی بەسەر پێیان وەکردبوو، زۆرم پێناخۆش بوو سەرم بردە بنەگوێ ي مەلای و گۆتم: مەلا توخوا بەسەر پێیان وەمەکە با خراب نەبن، وەکی دیقەتیشم دایێ مەلا بە کراشان زۆری کەشخە و جوان و بوو و کراشیش هی من بوون ئەمنیش کەونە پێراوەکم دە پێدابوو زۆرم پێناخۆش بوو حەزم دەکرد هەموو خەرك بزانی ئەو کراشانە ئێ منن.

پاش نوێژێ عەسرێ شایي پیاوان دەست پێکرد و کوڕ و گەنجی گوندی مەلایان بردە ناو شایێ، ئەمنیش کە دیتم مەلا بە کراشێ من

هەڕەپەڕی هەر راست شێت بووم و چوومە دەستی مەلای و گۆتم: توخوا ئاگات لێبن وەسەر بەردان نەکەوی تازەما کرینە!

مەلا شاپی راگرت و کراشی لە پێکردن و دەدەستی گرتن و گۆتی: خزمینە ئەو کراشە نوێیانە ئێ شێرۆینە بە پیاوەتی وێدایمە و زۆری مەمنونم , مەلای کراش وێدامەوەو بە پێخوامی چۆوە ژۆرێ و پێراوی سێ مێشی خۆی دەپێکردنەوەو بە قەستی شەق دە بەردان هەرەدان.

**** **** ****

*-حاجی مەلا (حەمید) کە زیاتر بە مەلا( عەمیر) بەناوبانگە،هەموو قالبی قسەی خۆش و نوکتەیە،ئەگەر بەکێك نەیناسي ئەڵێ قسەکانی هەموویان کفرینە،

لە وشکە ساڵیەکەی نەوەدەکان ئەوەبوو باران نەباری ،بانگی ئاوارەی کوڕی ئەکات و ئەڵێ:

ئاوارە وەرە دوعایان بکەین باران بباری ،ئەوجا دینارەکتە دەمێ،دینارەکەی ئەداتێ و خوایە بباری خوایە بباری،گەوارەکەی تێپەڕاندو هیچ نەباری ،ئەوجارە هەندێك هەوری هینایەوە بەر ئاسمانێ بەهەمان شێوە دینارەکیدی ئەداتەوە بە ئاوارەی ،ئەوجاریش نەباری،

دەبەر ئاسمانێ راوەستاو گۆتی وەڵڵاهی یان رووتمەکەی یان رووتتەکەم.

*-هەرلە وشکە ساڵیەکەیدا باران نەباری،ئیدی هاوین داهات و لەمانگی تەممووزدابوو،هەندێك هەور پەیدابوون و کردیە شەڕەبرووسك و تەق و هۆڕ،

مەلا حەمیدی روو لە ئاسمانێ کردو گۆتی(بەو زستانە دوورو درێژە هیچت نەباراند،تازە بەتەمای بارانێ بباریی،هیچت وێنیە،تەقەتەقی ناوێ.

*-مەلا حەمید زۆر لە (حاجی محمدی فەقێ عەیزی) ئەترسا،پیاوەکی زۆر بەساف بوو،خەڵك زۆری لێ ئەترسان،ئەو جێیەی ئەوی لێبا مەلا حەمید تخوونی ئەوێندەرێ ناکەت،

پاش ماوەیەك لە وەفاتکردنی حاجی محمدی،دیار بووە چەند شەوێك،چۆتە خەونی منداڵەکانی،منداڵەکانیشی لەلای مەلا حەمیدی باسي هاتنە خەوی باوکیان دەکەن،

مەلا حەمیدیش ئەڵێ:

کورینە ئاگاو لەخۆبی بەخوای ئەوە ئەیەوێ ئێکی دی دەگەرەخۆ ببا،یەعنی ئێکەك و لێ بمری،ئەگەر ئەوێ جارێ هاتە مارێ و بیدەنە بەر بەردان لێنەگەڕێن بێتۆ مارێ.

*- حاجی مەلا حەمید پاشی کیمیابارانی ماڵی دەباتە هەرتەلێ،تاماوەیەك خۆی کر دەکات،سەروەختەکی ئەوێش بڕیاری تێکدانی لۆ دەرەچی،ئێوارەکی ماڵی هێنایە خانوەکی لە ئۆردیگای شکارتەی ،خانیەکە لە پێش ماڵێ مە بوو،هەتا ماڵیان بردە ناو خانیەکەی،بووە باران و لافاو هەستاو ناو چووە ماڵیان،ئەمنیش چوومە دوایان هینانمە کنە خۆم،مەغریب داهاتبوو،خێزانەکەی

منیش بەحوکمی ئەوەی کەخزمی یەکین ،گۆتی مام حاجی هەڕوو لە حەمامێ دەستنوێژێ هەڵبگرە ئاوە گەرمە،

حاجی مەلاش گۆتی لەهەرتەلێی لێتێك دام ،هاتمە ئێرە ،لێرەش ماڵیان هێخستمە بەر لافاوێ،تازە نوێژێی لۆناکەم...

**** **** ****

*-چەند سارەك پێشی ئەلعان حوکمەت سلفەی دەدا لۆ خانی کردنی لە گوندان , مام کەمالیش وەکی خەرکی سلفەی راکێشا و لەسەر کاولە خانی دەستی کردەوە بە خانی کردنێ, رۆژەکی لە گوندی ڕا دەچۆوە هەولێرێ و سەیارەشی نەبوو لەگەر مام قادری چۆوە , لە ڕێێ مام قادری وەگۆ: کەمال باشە ئەتوو خانی لۆ چیە لەگوندی چاکەی لێرە, مندارت دەگەر نێنەوە ئەو مەسرەفەی لۆ بەبەلاش دەکەی خۆ سلفەش بی هەر دەبێ بیدەیەوە قەردە؟

مام کەمالی وەگۆ :واللە ئەمنیش وەکی عالەمێ, ما چم لە خەرکی کەمترە؟ لۆ خۆ ۲۰۰ مێشەکی دەکرم سارانە داهاتەکی باشم دەبێ نزیکەی تەنە هەنگوینەکم دەبێ کیلۆی بە ٥٠ هەزاری دەفرۆشم و خۆی پێ بەڕێوابەم لێشم زیادە.

مام قادری وەگۆ: کەمال ئەدی ئەگەر مێش مردن هەنگوینت نەبوو ؟

مام کەمال گۆتی: هەنگوین دەبێت ان شأ اللە.

مام قادری وەگۆ باشە کێ دەرێ هەنگوین ئەو پارەی دەکات ؟

مام کەمال گۆتی : لە ٥٠ هەزاری کەمتر نافرۆشم و دەشکات هەنکوینی ئەسلیە.

مام قادر گۆتی: لۆ منیش کەمتر نابي خۆ ئەمن مامی توومە؟

مام کەمال گۆتی : یەك فلس کەمتر نادەم ئاخر سعرە.

مام قادر گۆتی: ئاخر ئەمن بە سەیارەی خۆ دەتهینم و دەتبەمەوە هەولێرێ و مامی تومە؟

مام کەمال گۆتی : دەی سەیارێ راگرە، مام قادری سەیارەی راگرت و مام کەمال دابەزی و گۆتی قادر باشت گوێ لێبي والله وبالله وتالله کیلۆی لە ٥٠ هەزاری کەمتر نادەم چیدیکەش سواری سەیارێت نابم خوا حافیزت بي.

**** **** ****

*-چار پێنج سار پێشي ئەلعان رەمەزان کەتبۆ وەختی گەرماێ ، خەرك هەموو لەبن دیواران دانیشتبوو و قسەو باسیان دەکردن، یەك دەیگۆ ئەو سار چ برسی نابم بەس تێنیەبم، ئێکی واگۆ نەبرسیمە نەتێنیمە بەس وەختە لۆ قومە جغارەکێ شێت بم، یەکەکی دی دەیگۆ الحمدلله ئەو سار هەرزانیە و قات و قڕي نیە.

مام کەمالیش هەریداێ و گۆتی بەخوای ئەو سار رەمەزانەکی زۆر بەزەحمەتە!

جەماعەت گۆتیان مام کەمال خۆ ئەتوو تا ئەلعان رۆژیەکت نەگرتیە چوزانی رەمەزانەکی بە زەحمەتە؟

مام کەمال گۆتی: ئاخر لە موسرمانانرا دەزانم چونکە زۆر بێسحەت و بێزار دیارن , هەناوم لۆ دێنە خوارێ.

**** **** ****

*-سمایل و پۆلس چەند سارە شەریکن و معامەلەی حەیوانان دەکەن, رۆژەك حاجی شەفیق بە سمایلی گۆت: ئەرێ سمایل ئەو پۆلسە فەلەیە پێدەچی پیاوەکی چاك بي دەنا کو ئەو چەند سارەی دەگەرە تووی ئیدارا کرد؟

سمایل گۆتی: ئەرێ واللە پیاوەکی چاکە بەس یەك عەیبی هەیە؟

حاجی شەفیق گۆتی: چ عەیب سمایل؟

سمایل گۆتی: تا ئەلعان نەمدیتیە نەنوێژەکی بکات نە رۆژیەکی بگری

**** **** ****

*- ئەو قەڵایەی کە پێی دەڵێن قەڵای بانەمان،لەبەر ئەوەی لەگوندی بانەمان نزیکە،بەقەڵای خانزادیش ناسرایە،

جاران لەنێوان ئەو قەڵایەو گوندی بانەمانێدا سەرچاوەیەکی ئاوی لێهەبوو،کانیەکی روون و جوان ،لەنزیکی کانیەکەی چایخانەیەك هەبوو،ئەو چایخانەیە خواردنیشی هەبوو،لۆیە کاروانچیەکان و رێبواران کەلەدەشتێ هەولێرو موصلێ دەگەڕانەوە،لەوێ ئیسراحەتێکیان دەکردو یە ك دوو چایەی گەرمیان دەخواردەوە،یان نانەکیان دەخوارد.

سەرەتای شەستەکان ،لەگوندی کۆڕێ ،دوو ئامۆزا(حاجی خالید و حاجی خالند) پێکەوە هەنارو ترێیان دەبردە گوندەکانی دەشتی هەولێرو لەو سەرێشەوە گەنمیان دەهێناوە،لەهەردوو سەری چوون و گەڕانەوەدا لایان دەدایە ئەو چایخانەیەو چەند چایەکیان دەخواردەوە،زۆربەی جاریش حاجی خالید پارەی چایەکانی دەدا بەبێدەنگی،تەنها جارێك حاجی خالند پارەی چایەکی واسل کردبوو،ئیدی کەر کەت و کوندە دڕا،لەهەر جێیەکی دانیشتبان حاجی خالندی ئەو چایە بەچاو حاجی خالیدی دا ئەدایەوە،شەوەکێ ساردو سەرمایەکە،بەفر کەتیە،هەردووکیان لەگەڵ ردێن سپیانی گوندی ئەچنە دیوەخانێ(مجیداغای کۆڕێ)،مجیداغاش پرسیارەکات ئەڵێ:

ئەرێ ئەو سار کاروانکردن و گەنم هینانتان کو بوو؟

حاجي خالندیش جوابەداتەوەو ئەڵێ:

ئاغام خۆشبی زۆر باش بوو،ترێ و هەنارەکی زۆرن بەخۆو بە حاجی خالیدی بردە دەشتێ هەولێرێ و بەگەنمن گۆڕیەوە،لەحاجی خالیدی

پرسە وەکی گەڕاینەوە لەبانەمانێ شتۆ چای بەتامم لۆ کڕی،ئیدی حاجی خالید بەبەربەوە نەما،ناعیلاج هەستاو گۆتی ئاغا خزمینە،خالندی حەیاو ناموومێ من بردیە هەندی ئەو چایەی بەچاوە من دابداتۆ،ئەو هەموو سەفەرانەن کردینە هەر ئەمن پارەی چایەی دایە،لەیەك جاری نەبی پارەی چایەکی دایە،

حاجی خالید هەستا سەر پێیان و گۆتی ئاغا.جەماعەت.کەس لەجێێ خۆی هەرنەستی،قورئان بە هەقت بەساحێبت،نابێ کەس بجوولێ،تا دیمەوە،رۆیشتە دەرێ و زۆری پێنەچوو،هاتەوەو گۆتیە حاجی خالندی هەستە بابرۆین،حاجی خالندی هەرچەندی پاڕاوەو گۆتی ئامۆزا ئەمن کردیە ئەتوو نەکەی،حاجی خالیدی گۆتی شتێ وانیە،هەردوو هێستری کورتان کردبوون و بەو شەوەو سەرمایە بەسەر چیای پیرمامیدا سەرکەتن و شۆڕبوونەوە لۆ چایخانێ بانەمانێ،گۆتیە ساحێبی چایێخانێ:

لەو چاوەتە هەتا یەك حەفتەی ئیزنی نەدەی سێجەمە خواردنێ بدێ و رۆژێش دەچایانی بەژمار دەدەیێ،لۆ ئەوەی جارەکیدی ئەو ناموقولیانە نەکات،خۆ ناموست بردم لەسەر چایەکی.

* * * *          * * * *          * * * *

*-ده پازده سار پێشی ئەلعان مام عومەرەکمان دەگەردا بوو لە دەوامێ,دەگەر رۆژیان یەك نەبوو ئەمما لە ترسێ مارێ ناوێرا بەرۆژی نەبي, رۆژەکی گۆتیە یەکەکی وەرە با بچینە مارێ مە بیرەکم لێدایە هەندەك خۆرێ لێ دەردەین کە وەکی خۆی بە رۆژی نەبوو ناوی سۆران بوو.

گەیشتنە مارێ و مام عومەرچووە ناو بیرێ بڕەك ئیشي کرد, سۆران هەنارەکی لۆ هەردا ناو بیرێ و گۆتی ها بخۆ تا خونچە دیار نیە, مام عومەر هەناری کەرتك کرد و دەستی بە خواردنێ کرد, لەولاشڕا سۆران بانگی خونچێ ي کرد و گۆتی: ئەها پلکە خونچە مام عومەر لەناو بیرێ هەنارانا خواو بەرۆژی نیە!

خونچە بە بێ دەنگی هاتە سەر بیرێ , مام عومەری هەر واگۆ کوڕە سۆران ئەگەر ئەو بەرایە هات زووم وەبرێ.

لەناکاو خونچە قیژاندی, ئەیەڕۆ عومەر ئەوە چاکەی بەرۆژی نی؟

مام عومەر: بەخوای خونچێ خەتای ئەو سۆرانە نا جسنەی بوو هەناری وێدام.

خونچە: جا ئەوە هەناریشي وێدای ئەتوو لۆ ئەخۆی ؟ خۆ بە تۆبزیت دەزاری نانێ؟ باشە ئەوە خۆت لە من شاردەوە ئەدی خوای چ لێکەی ؟؟؟ هەی کافر.

**** **** ****

*-مام کەمال ئێواریّ گەڕاوە ماریّ و گۆتی زولێ بە چ ئیفتاریّ وەکەم؟

زولێ وەگۆ:کەمال ئیفتاریّ چ خۆ ئەتوو ئی بەرۆژی نی؟

مـام کەمـال: نانـا زولێ هەنـدەش ئی بێ دیـن و دووره خـوا نـیم،ئەگەر بەرۆژیش نەبم ئیفتاریّ هەرەکەمەوە!!

**** **** ****

*- رەحمانی حاجی محمدی بەرەحمەت بي گێڕایەوەو گۆتی:

سـاڵی حەفتاکان بـابم ئەچووه سـەفەری حەجێ،ئەمنیشی لەگەڵ چـووم هەتـا هەولێریّ،دوای تەواوکردنی پەسـاپۆرت،ئێواریّ ئەمنـیش چـوومە بازاڕی،تەماشــەم کــردێ کــابرایەك (حەلــوا) ی لەســەر عارەبانێــدا دانـابوو،زۆرم حەز چـووه حەلوای،هەسـتام بـاپي (درهەم)ێکـم حەلـوا لێکڕی،لەناو نایلۆنەکانیدا داناو ئەمنیش لەبەر پشتێمدا دانا،ماشەڵڵا جێــیەك نەبــوو ئەمــن ئەو حەلــوایەی لێبخۆم،هێــواریّ چــووینە ماڵی(حـاجی حەسـەنی سـارتکی) لەسـێتاقان،لەوێش دوای نـانخواردن ،یەك دوو جـار ویسـتم بچـمە دەریّ لەپەنـایەکی ئەو حەلـوایەی بخـۆم نەگونجـا نەگونجا،بەناچـاری وەختی نووسـتنێ چـوومە ئاودەسـتێ و لە وێم خوارد..

**** **** ****

*-مام خالید و حاجی سدیق لەکن یەك دانیشتبوون , مام خالیدی وەگۆ: سدیق شەوێدیم خەونەك دیت, لەموابي بە کۆرۆنای مردبووم و سواری ئەسپەکی سپی ببووم لۆ عاسمانێ برند بووم و دەرکەی عاسمانێم لۆ کراوە و بە هەشتم لێ وەدیار کەت......

حاجی سدیق لێنەگەڕا مام خالید قسێ خۆ تەواو کات و گۆتی: حەتمەن ئەسپەکەیان بردیتە ژۆرێ و دەرکەیان لەسەرە توو داخستیتەوە!

**** **** ****

*-حاجی حەسەنی توتمێ کەبە حەسەنە کۆر ناسرابوو، بەرەحمەت بی پیاوەکی زۆر کورد پەروەر بوو، هەموو ژیانی لەو پێناوەدا تەرخان کرد،لە سالانی حەفتا چوو بۆ سەفەری حەج،ئەوانەی کەلە گەڵیدا هاو سەفەر بوون(شێخ ابوبکری بالیسان) دەبێ،دوای تەواو کردنی معامەلات و رێکارەکان،بەڕێدەکەون،ئەو کات دیارە هاوین بووە،سەیارەش نێرینی ١٨ نەفەری هەبوون،هەتا بەغدائ لەوێوڕا دەڕۆیشتن،

ئیدی کەدەگەنەسەرچیای (حەمرین) حاجی حسن بانگی شوفێرەکە دەکات و ئەڵێ راگرە،ئەویش سەیارەی را دەگرێ ،حاجی حسن دەچیتە خوارێ و تەکلیف لەنەفەرەکان دەکات کەبچنە خوارێ،

ئەوانیش هەموویان دێنە خوارێ،حاجی حسن ئەڵێ خزمینە ئەگەر ئەمنیش مردم لەبیر نەکەن ئێرە حدودی کوردانە،یەك لە هاوسەفەرەکانی ئەڵێ:

ئەری. حەسەنە کوڕ وەختی هەندێیە؟ئەمە ئەوا دەچینە حەجێ.

ئەویش ئەڵێ: ئەوجا چبکەم ئەو سۆزەی لەدڵی مندایە،لەلای نگۆ نیە.

**** **** ****

*- مەلا برایم و حەسەنە گەورە زۆر برادەر بوون ،سوعبەتیان لەبەینیدا هەبوو،زمانیان لەراست یەکتردا زۆر پیس بوو،بەبێ یەکتریش نەدەحاوانەوە،

وا رێك کەت مەلا برایم سەفەرێ عومرەی لۆ رێك کەت و معامەلاتی تەواو کردو پەساپۆرتی وەرگرتۆو وەرێکەت،دڵیشی هەرلای حەسەنە گەورەی بوو،

گەیشتە جێ و دوو رۆژی پێچوون،حەسەنی رەقەم تەلەفۆنی لەمنداڵێ مەلا برایمی وەرگرت و تەلەفۆنەکی لەبۆ کرد،ئەو وەختی تەلەفۆن لۆ مەلا برایمی هات ،ئەو لەناو بەیتێ بوو،ئەتوو چاك و ئەمن باش ،حەسەنی گۆتە مەلا برایمی :

مەلا برایم خوایا لۆ رێك هێخستی و ئەوا لەناو بەیتێی ،رەجاییت لێکەم،تۆبەکی نەسووح بکەو واز لە گەوادیان بینەو چیدی ئیشێ قۆڕو قسێ قووندەر مەکە،ئەگەرنا بێیەوە(ئەوهاو ئەوهات) لێکەم،

مەلا برایم لەناو بەیتێیەو ئاگری لێباری ،وەڵامی دەداتەوەو ئەڵێ:

وەڵڵاهی حەسەن لەجێیەکی هەند پیرۆز موبارەکم،چ قسەم پێناکرێن،بەس بابێمۆ هەنگینێت داکێ گێم.

**** **** ****

*-خزمەکمان هەیە ناوی مەجیدە زۆر لە ماریێ دەترسێ و بێ پرسی ماریێ ناوێری هەناسەی بخواتەوە,رۆژەکی جەژنەبوو هاتە ماریێ مە و ئەمەش مەلایەکن میوان بوو وەالحاسڵی مەلان تێگەیاند گۆتن بڕەك نەسیحەتی ژنەی بکات فرسەتە, با ئەوەندە سەری دەسەر سەری کابرای نەنێ و بڕەك جرەوی لۆ شلکات, مامۆستا دەستی بە نەسیحەتان کرد:

خزمینە دەبي لەگەر ئێکدی چاك بن..

ئێکدی و خۆش بوێ....

خزمێ ئێکدی و خۆش بوێ...

لە ئێکدی بە هەنجەت نەبن ....

بەقسێ ئێکدی بکەن...

دوایێ هاتە سەر مەوزوعی وگۆتی: داکەکەی داکم حەق وەنیە ژن ببیتە جاسوس لەسەر مێردی و مێردی فەقیر نەوێری بێ پرسی ژنێ بستەك دوور کەویتەوە لە ماریێ.

ژنەکە یەکسەر وەجواب هات و گۆتی: بەخوای ئەمن وەنیمە مام وەستا, بەو قورعانەی لەسەر ڕانت دانایە ئەوێ رۆژێ مەجید بێ پرسی من چۆوە کۆیە و هاتەوەش هیچم نەگۆتێ.

**** **** ****

*-ئەگێڕنـۆوە ئەڕێـن کـابرایەکی لای خـۆن لەکـاروانیەو پاییزە،بـارەکەی ئەگەینیـتە موسـرێ ،لەهـاتنەوێ هەرلەموسـرێ وەڕێـکەوی بـارانی وێـکەوی ،ئیـدی هەمـوو لەشـی تەڕەبی،لەخـۆی وەڕزەبی،لەدڕی خـۆدا بڕیارەدات و ئەڵێ:

وەعـدبی هەردەشـتیەکی لەسـەر ڕێێ ببیـنم و بـرێ پەرەی نەدایە،دەبی تێری تێهەردەم.

ئیـدی بەڕێـکەوت ئەگـاتە کـابرایەکی دەشـتەکی،هەروەکی ئەڕێـن در ئـاوێنەی دریە،تەماشـای مـام خۆشـناویەکات ،ئـاوی لێچۆڕێتـۆو ئـاگری لێئەباری ،لۆێ لای مسـۆگەر بووە کەوا ئەو پرسـیارەی لێئەکرێ،کابرای خۆشناو بەێ ئەوە سەلام و ماندی نەبوونێ بکات ،یەکسەر ئەرێ:

پەرەی دایە یان نا؟

دەشـتەکیەکەش ئەرێ،بەخـوای مـام خۆشـناو ئەگەر لەترسێ تـوو نەبی نەوەڵڵا پەرەی نەدایە...

**** **** ****

*-حــاجی محمدی فەقێ عەیـزی ،پیـاوەکی تێـك سـمراوی زۆر بەسـام بوو،خەڵك زۆر لێي دەترسـان ،لەرەمەزانانـدا زۆر تـووڕە دەبوو،گەلێك جار لەخێزانەکەی دەدا،خێزانەکەی دەیگێڕاوەو ئەیگۆت:

ئێـوارەیەك هەرچی کێشـەیە نەمـانبوو،ئەوەی خـوا بەنسـیبی کردبـووین لەخواردن،ئامـادەم کردبوو،چـاوەڕێي بـانگي مەغـریبن ئەکرد،لـۆ فتـار کردنەوە،سـەروەختەکی هەر هەرسـتاو دەسـت دایە دارێـك و زۆری

لێدام،ئەمنیش پێم گوت باشە لەبەر چ لێم نەدەی ؟ئەورۆ هەرچی کێشەیە نیتمان،هیچی پێنەما گوتی :

وەڵڵا پێرێ هێوارێ ماستاوت نەکردبوو...

**** **** ****

*-برادەرەك گێڕایەوە گوتی: ساری حەفتاکان بوو مارمان لە گوندی بوو، رۆژەك لە گوندی ژن گواستنەوە بوو شایي و رەشبەرەك دەگەڕا، دەنگێ دۆر و زورنایێ دەگەیشتە حەفت تەبەقەی عاسمانێ . گوتی ئەمنیش گەرم بووم و خۆم هاویشتە ناو شایێ هەردەپەڕیم ئەمما هەرپەڕین، کابرای زۆرنا ژەن لولەی زۆرنایێ ي هینا بنا گوێ ي من، ئەمنیش قڕانەکم وێنیە، رووم وەرسوڕاند لۆ لای دی، ئەو جار هاتە لای دیش،رووم وەرسوڕاندەوە، والحاسڵ زۆری لێکردم و گوتم کاکە ئەتوو تێناگەی؟ بەخوای زورناییێم دوڕ چاوش ڕاکەی فلسەکم لێ هەرناوەرێ چونکە چم وێنیە جا لۆخۆ هەرو ئێقەی ئێکەکی دی بگرە و واز لە من بینە.

زورنا ژەنی وەگۆ: سەگی سەگ باب ئەدی مادام فلسەکت وێنیە لۆ ئەوها هەرپەڕی هاا!؟

**** **** ****

*-کۆمەرەك رنگر  رێي لە مام سمايليە گرن، چەندی هەرگێڕ و وەرگێڕی پێ دەکەن هیچی وێنیە بێجگە لە سعاتی دەستی، دزەکیان دەرێ ئەو سعاتەی لە دەست بکەوە بەس خۆ ئیشیە کات؟

مام سمايل دەرێ :ئەرێ واللە، ئەگەر ئیشي نەکرد لۆم بیننەوە!

****          ****          ****

*-ئەگێڕنەوە فەقێیەکی (نابینـا،کوێر) لەمزگەوتی (سـەقا) بووە،ئـاوی مزگەوتی سـەقاش ئـاوێکی زۆر بـووە،فەقێ کـابرایەکی دڵ تەڕبـووەو زۆر حەزی لە ژن بـــووە،هەر دەپرســـي لەبرادەرەکـــانی کە ژنێکـــی بـــۆ بیننەوە،رۆژێك برادەرێکی ئەڵێ بێوەژنەکە تەڕو تازی هەیە،ئەویش داوا لەئەهلی مزگەوت ئەکات کەبۆی بچنە داخوازی،هەرچەنـدە پێي ئەڵێن ئەو ژنە لە قەوام و هێـزی تـۆدانیە،بێ سـوود بووە،بەناچـاری ئەچـنە داخـوازی و بـۆی دێنن،هەتـا هەفـتەیەك فەقێ بـزرە بی ،رۆژی هەشـتەم لەمزگەوتێ پەیـدا دەبیتەوە،زسـتانەو کـۆمەرە خەرکەك لەبەر تیشـکی رۆژ دانیشـتینەو خۆیان گەرم دەکەنەوە،

فەقێ ی حافز هەردەگاتە لایان و ئەڵێ:هەرسێ تەلاقم کەوتبێ ئەو کانیە یەك دڵۆپە ئاوی تێدانیە.

ئەوانیش ئەڵێن کوڕە نەکەی فەقێ نەکەی،ئەوجارەش بەهەمـان شـێوە تەڵاقەکانی فڕێ ئەدات،

تازە کارلەکار ترازا،پێی دەڵێن بۆ وات کرد؟

ئەویـــش ئەڵـێ: کـــوڕینە مـــردم لەدەستی،دائەنیشـــم ،ئەڵـــي مەلا دەی،هەڵئەســـتم،ئەڵێ مەلا دەی،درێـــژەبم هەر ئەڵـێ مەلا دەی،وەڕز بووم ،قەسسەم بەخوای پشێ نیوەی خەڵکی شەقلاوێ دەکات،خۆمن مردم لەدەستی.

**** **** ****

*-خـزمەکن هەیە چـار ژنـی هەنە و چـار ماریشـي هەن, رۆژەکی لەگەر یەك دوو خزمـان چـوین غەتاسـی لـۆ لە بیرێ دەرینـین و چەکـوچەکن پێویا,گۆتی واللە چ چەکوچن نین.

ئەمنیش گۆتم: ئاخر کو دەبي چار ژنت هەبن و چەکوچەکت نەبي بە چار ماران؟؟؟

گۆتی: واللە ئەو چەکوچەی ئەمن هەیتم کەس نیتی .

ئەمنیش گۆتم: شەرتە غەتامی پێبکرێنەوە دەنا چەکوچی کەونە بزمارێ پینان ئەزۆرن.

*-تـازە کارەبـا هـاتبۆ گونـدی, خەرك کم تەلە فیزۆنیـان هەبـوو, ئێـوارەکی خەرکەکـــی زۆر لە دیوەخـــانێ مـــارێ کوێخـــای لەبەر تەلەفیزیـــۆنی دانیشـــتبوون, ئەفـــلام کـــارتۆنی لەســـەر بوو,منـــداری گونـــدیش لە پەنجەرەیڕا بە دزی چاویان لە تەلەفیزۆنیە کرد,

حـاجی قـادر : تەماشـایەکی پەنـجەرەی کـرد و گـۆتی: خـزمینە زەینێ خـۆ بـــدەنێ ئەو کـــافرانە چەنـــد جـــوان ئەو پاپایەیـــان دروســـت کـــردیە مندارانیش حەزا چیێ.

**** **** ****

*-حـاجی مســتەفای مـام یەحیـای غەریقی رەحمەتی خوابێ،شـەوێك لەدرەنـگ ئەچیــتەوە ماڵەوە،تـاریکەو جوانەگایەکیـان هەبــوو،لەبن قادرمە نووستووە،ئەویش نایبینی پازدەداتە سەر قـادرمەو لەو وەختیدا جوانەگا هەڵدەستی،حاجی مستەفا ئەکەویتە سـەر پشتی،توند گوێی جوانەگایە گری،جوانەگاش بەهێز بووە،بەو شەوەی هەموو ناو گوندی پێئەکات ،لەناو قەبرستانێ شێخ مەلا حەسەنی بەرەداتە خوارێ،چەند رۆژ بوو حاجی مستەفا لەبەر ئازارێ قالبی خۆ نەیەتوانی بچێتە دەرەوە.

*-هەر حـاجی مسـتەفای مـام یەحیـای ، شـەوێك لە شـەوینە، شـەوین ئەوەیە بەشــەو بچی مـێگەلە بزنـێ بـبەیە چیـای بیلەوەرێنی، ئەویـش دەست بێنێ گری،(دەست بێن) بریتی بوو لە پەتێك یان پارچە کندرێك یـام گوریسـێك لەدەسـتی خـۆی دەئاڵانـد، سـەرەکەی دیکەشی لە ملی بزنێك قـایم دەکـرد، سـەروەختێك حـاجی مسـتەفا خەوی لێـدەکەوێ و دەسـت بێنی لەدەسـتی دەبێـتەوە،بەخەبەر دێـت، سـەیرەکا وادەزانـی مارەو سـەری لەدوو بزنێ نـایە بەبەردان دەکەوێتە دوای بزنێ، ئەوەنـدە بەرد لەدەست بێـنەکە دەدات هەتـا پارچەپارچەی دەکات، سـەیرەکات ئەوا پشدێنی خۆیتی و کردیتیە دەست بێن.

**** **** ****

*-سالحی وەگۆ: رۆژەکی ئیشەکم کەتە کۆیێ و چوومە چاخانەکی بڕەك ئیسـڕاحەتی بـکەم ،پاشـی چـا خـواردنەوەی هەر بە فکـری مـاریێ و میواندار پیارەم نقـون کـردەوە یـاعنی جی دی نـاخۆمەوە،وەکی تێڕامـام خەرکم هەموو چاو لێکەن و لەبن سمێراندا پێم پێکەنن، ئەوجا زانیم غەرەتەکی گەورەم کردیە، ئەفەندیەك گۆتی: خارە خەرکی کێندەریێ ی؟

گۆتم: لۆ؟

گۆتی : پێدەجی خەرکی ئێرە نەبی؟

گۆتم: کوە زانی؟

گۆتی : بە پیارە شکاندنەوەت.

هیچ خۆم تێك نەداو گۆتم: برا ئەو پیارە لێوی شکابوو گۆتم با چایجی بزانی و لۆ یەکەکی دی نەباتەوە و برینداری بکات!

**** **** ****

*-گورێی مام مەغدیدی شەشی تەواو کرد و ناوی لە زانکۆی سولێمانیێ هاتەوە،پاشی دوو مانگان پێنج شەمەکی هاتەوە ماریێ، داکی گۆتی کچم حەزت لە چیە؟ شفتانت لۆ بکەم؟

گـورێش یـاعنی لە شـاربڕا هـاتیتەوە و زمـانی فێربـووە، گـۆتی: حەزم لە شلەیە خەریکە بۆ شلەی شێت بم!

مام مەغدیدی گوێ لێ بووهاواری کرد، کچێ هەی سەر بە ڕشکی بەڕەڵا ئەمن ئەتووم لۆ خیندنێ ناردیتە سولێمانیێ یان بجی حەز حەزۆکانێم لۆ بکەی ؟ لەگەر کەسیش نا لەگەر شلەکی؟؟؟

*-بەرەحـمەت بـی ( صـالحی قـادربەگی) پیـاوەکی قسـە خـۆش بـوو، لەنەوەتەکـان مـاڵی لە شـەقلاوە بـوو، ئەو کـاتی یـۆبیلی زێرینی پـارتی بوو،دەبوایە هەموو ماڵێك پەڕۆکەکی زەرد لەسەر بانی هەڵبوامي،

ئیدی ماڵی مام صالحیش پەڕۆیەك هەڵ ئەدەن،

دیارە لەلایەن ناوچەوە بانگ دەکرێ،پێی ئەڵێن :

ئەوە بۆ پەڕۆیەکی ئەوها گچکەت هەڵدایە؟

مام صالحیش ئەڵێ: وەڵلاهی کاکە ئەمنیش هەر هەندە پارتیم.

**** **** ****

*-پاشی ئینتیفازەی وەزع لەوپەڕی خراپیدا بوو ژیان زۆر زەحـمەت بـوو گـرانیەك بـوو مەگەر خـوا بزانـی چ گرانـی! خەرك بەشـی هەرە زۆری تـاقەتی پـاکەت کڕینێي نەبـوو تـوتنی دەکـڕی کیسـە تـوتنی دەبەر پزیـێ شـەرواڕێ راکرد,پێراو چوپی دوو مێش بوو, برنج جومعانە خورا, گۆشـت جەژناو جەژن.

مەریـوانی وەگـۆ: شـەوەکی زمسـتانێ پـاش نـوێژی عیشـایێ چـوومە مـارێ باپیری, دەرکە پێوە درابوو لەبەر سەرمایێ, وەکی دەرکەم کردەوە باپیر و حـاجی قـادر ژۆریـان قانـدابوو دەگەر دووکەرێ, چـاو چـاوی نادیـت! ئەمنیش بەزمانی سۆتای گۆتم ئەو دوو کەرە چیە لە ژۆرێ؟ کاکە هەر ئەوەندەم دیت چەراکی سەربە قەوانم لەسەر پیلی هەرزۆقیەوە, ئاگرم لە چاوان برند بوو هاوارم کرد وەی بابە!!ئەوەچ بوو؟

باپیر گوتی: ئەوەچت دیتیە نەژاد کەر؟ئەو دوو کەرە کین؟ خۆ هەر ئەمن و حاجی قادری لە ژۆرێین؟

**** **** ****

*-رۆژەکی لەگەر برادەرەکی راوەستا بووم ناوی عبدالله بوو لاقی بە دەعمی سەیارەی شکابوو بڕەك ئەشلی، بابی بانگی کرد گوتی عەولا کسۆکی شلە ؟ ئەوە چا کەی؟ لە کێندەری؟

عبدالله گوتی: بەرێ بابە گیان ویەکسەر غاریدا لۆ کن بابی.

رۆژەکی دی دیتم بابی بانگی کرد گوتی: عبدالله؟کوڕی خۆم، تاقانەی بابی، بەس عبدالله خۆی لێشاردەوە.!!!!

زۆرم پێ سەیر بوو پیم گوت: باشە برا ئەوێ رۆژێ بابت بە کسۆکی شلە بانگی کردی یەکسەر چووی، ئەوڕۆش بە نەوعەکی زۆر جوان و رێك بانگی کردی بەرام خۆی لێ دەشاریەوە؟ لۆ؟

عبدالله گوتی: ئاخر وەکی ئیشي پێمە بە نەوعەکی جوان وەکی ئەوڕۆ بانگم دەکات ، وەکی ئیشیشي پێ نیم وەکی ئەوێ رۆژێم بانگە کا، بە کورتی و ئەوڕۆ ئیشي پێبووم لۆیە خۆم شاردەوە!!

**** **** ****

*-وەختی کۆڕۆنای مام عەزیز گۆتیە گورێ خێزانی: گورێ کە گەرەنتینە تەواو بوو حەزت لێیە بچیە کێندەر؟ وەکی تەماشات دەکەم زۆر وەرەز و بێزار دیاری؟

پلکە گور گۆتی؟ خوا بکا کەرەنتینە تەواوە بی و ئەتووم لە کۆرە بیەوە، قیڕومي لەمن با ئەمن لە مارێ بڕزم و سندانم لێدا.!!!!!!

**** **** ****

*-مەلا حوسێن کابرایەکی زۆر پولەکی و رەزیل و بە فرت و فێربوو، حەزی دەکرد لایەکی جەرگی سندانی لێدا نەك دینارەکی لە گیرفانێ بێتە دەرێ،پێشی جەژنێ کوڕی هەنجەتانە گری و دەرێ ئیللا دەبی قاتەکی کوردیم لەکن خەیاتی لۆ بەدوورین دەی،ئێ قاتیش پارەی دەوێ کوڕەش لەسەر مەتلەبێ خۆ موسیڕە!!

بە ناچاری پیلی کوڕەی دەگری و کەونە جەمەدانیەکی لەسەریە نێ و دەچیتە دوکانێ قادر خەیاتی و دەرێ مام قادر ئەو فەقێیەم هینایە فەقیرە و پارەی نیە ئەگەر لەسەر حسابێ خۆ قاتەکی لۆ بکەی؟

قادر خەیات دەرێ مام حوسێن ئەگەر ئەوەندە پیاوەکی بە رەحم و خێرکەری لۆ نایەی یەکەو نیوەی پارەی قوماشی لۆ بدەین و بە بەلاشیشي لۆ دوورم! یان ئەتوو درت نایێ دیناری لە گیرفانێ دەرینی؟

مەلا حوسێن دەرێ: وەی هەزار جار و پارەی من چەندەکا هەتا ئەلعانت دەمێ؟

پاشـي چەنـد مانگـان مـام قـادری خەیـات لە مەجریسـەکێ خـۆی فشـەکاتەوە و دەرێ خەرکیـنە هەر دەرێـن مەلا حوسـێن پـارەی لە گیرفانێ دەرنایێ واللە ئەمن پارەی نیوەی قاتەکی فەقێیەکم پێدا.

سۆفی رەحمان دەرێ: یان ئەو نیوەی پارەی بە توو دا؟

مام قادر دەرێ: ئەمن کاکتم کاکت نا واللە ئەمن نیوەم بەویدا.

سۆفی رەحمان دەرێ: تەڕت نیوە پێدا قادرە گۆج، کوڕە هەی غەریب حار ئەو فەقێیە سـاڵحۆکی کوڕی بـوو، واللە وەی کورتـان کـردی بە چـار بـارە دارانیشت کورتان لەسەر پشتێ شل نابیتەوە.

*-بـرادەرەك گێڕایەوە گۆتی دەوامـم لە سێتەڕەی بـوو سـەیارەك هـات دوو سێ ژن و پیـاوی تێدا بـوون ژنەکیـان نیقـاب بـوو ئەمناسـین و پاشی چاك و چۆنی بەڕێم کردن.

لە دوو وان سەیارەك هات ژنەکی تێدا بوو خۆی سـواقدابوو بە مکیـاجی و زۆر بە تـوڕەیي گـۆتی : ئەوە لـۆ ئەو سـەیارەت بەڕێ کـرد؟ کـێ دەرێ ئەوەی دەگەریـان دابـوو ژن بـوو یـان پیـاو؟ کێ دەرێ داواکرای نەبـووە؟ کـوت زانـی ژنە و خـۆی نەگـۆڕیە و خـۆی نەشـاردیتەوە تـا نەیناسـن؟ لـۆ پەرۆت لەسـەر دەموچاوی لانەدا تا دەم و چاوی ببینی؟

ئەمنـیش گـۆتم: ئەگەر وەبـی دەبـي ئەتـووش دەم و چـاوت بشـۆی ئەو تەشتە میاجەی لێوەکەی هەتا بزانم ژنی و پیاو ني و داواکرای ني.

* * * *　　　* * * *　　　* * * *

*-پور فاتم دو مانگ بوو له حاجی قادری توڕه ببوو و چوبۆوه ماریّ کوڕي لەو بەری گوندی, بەرام زۆری حەز لێبوو بگەڕێتەوە کن مام قادری و نه کەسیش واگوّتیّ هەڕۆوه و نه مام قادریشي هاته دویّ, یەکەم رۆژی رەمەزانیّ بوو پلکه فات بوخچەی تێکنا و ملی رێیەی گرت لۆ ئەوبەری گوندی,

بۆکي وەدوو کەت و وەیگوّتیّ: دایه ئەوه لێن عادز بووی کەس قسەك گوّتیێ؟ خۆ چ نەبووه؟

پلکه فاتم : نا والله کچم, مار و ئاوا بي .

بوك: ئەدی لۆ ئەوها به دزی و به بێدەنگی دەڕۆي؟

پلکه فاتم: کچم گوّتم با گوناح بار نەبم رەمەزانه.

بوك: نا نا دایه ئەتوو ماریّ خوّته ئەو قسه چنه, قەت فکر نەکەیەوه لەو شتانه.

پلکه فاتم:مەخسەدم ئەوه نیه کچم, دەرێم رەمەزانه و قادریش بەرۆژیه بي و ئەگەر ئەمنیشي وەخەبەر نەینم لۆ پارشیویّ هەرناستیتەوه و دەترسێم بیّ پارشیوێشي رۆژی پیّ نەگیریێن و گوناح بار بم,گوّتم تا جێژنیّ دەچمەوه , ئەو خێرەی لۆ خوایه کەم.

**** **** ****

*-خزمەکی گوندی مەلۆکی بە رەحمەتێ بێ گیسکەکی دابەستی هەبوو خزم و برادەر ئێقەیان گرتبوو کە دەبێ هەمووانی پێ دەعوەت بکا وەکی کوشتیەوە, ئەویش دەشەرمڕا چوو بوو وەعدی دابوێ و گۆتبووی ان شأ ة الله.

خزم و برادەر خۆیان حازر کردبوو هەموو ئێوارانیان تاقیبەکرد بزانن گیسك مایە یان کوژرایتەوە و وەکی ئەو خزمەیان بە ڕسیە گیایەك دەدیت ئێواران دەچۆوە مارێ دەیانگۆ گیسك مایە و نەکوژرایتەوە .

ئێوارەکی بێ-ڕسیە گیا چۆوە مارێ خزم لەسەر بانی مزگەفتێ بوون و دیتیان و گۆتیان :مام حاجی دەرێی گیسکت کوشتیتەوە؟

گۆتی : ئەرێ والله نۆ رۆژە کوشتیتمەوە دونێ خەلاس بوو.

گۆتیان: کوڕە نۆ رۆژی چو حاری چ؟ ئەدی هەموو رۆژێت ڕسیە گیا نابردەوە لۆ گیسکی؟

گۆتی: ئەو ڕسیە گیایەم لۆنگۆ ئەبردنەوە نەك لۆ گیسکی!!

**** **** ****

*-خزمەکن هەبوو بە رەحمەتێ بي جغارەی زۆرەکێشان دایمی سیغارە بە لالێوێ وەبوو, رۆژەك سایەقەکي وەگۆتبوێ دەرێن بنێشتي بجوی جغاران تەرکە کەی, لۆ ئەتووش ماوەکي بنێشتي ناجوی هەتا جغاران تەرکەکەی و واز لەو ژەهـــرەی دینـی, بەخــوای هەم پیســــە و هەم حەڕامیشە.؟

پاشي ماوەکي کابرای سایەق ئەو خزمەی مەی دیتەوە و گۆتي ها چت کرد لەگەر بنێشتي ان شأ الله جغارەت کەم کردینەوە؟

خزم گۆتي: هەك سندان لە خۆت لە بنێشت و لەو تەگبیرەش بدات کە ئەتوو لۆ منت کرد باشە.والله ئا فێرە بنێشتیشا بوویمە و پێم تەرك ناکرێ, ئەلعان بنێشت و جغارەم وێکڕا ئە زاریدان.

**** **** ****

*-چەژنەکی کۆتـایي سـاری نەوەتەکـان بـوو زسـتانەکي سـارد بـوو لە هەولێرێ چرکە بەفرەك لەبن دیوارو پەناو پەسیوان هەر مابوو,لەگەر خزمەکی بەدیـن و قورعـان خـوین و بە تەمەن لە جەژنـانەی خزمـان داتیـنەوە لە سـەیداوەی هەولێـرێ, ژنەك لە دەرکەی مـارێ خـۆ هـاتە دەرێ و لەسـەر شـەختە و بەفرێ خزی رمبەی لێوەهات و پشتاو پشت بەربۆوە,

ئەو خـزمەن لە پـرمەی پێکەنینێیـدا و پەشـیمانیش بـۆوە بەس تـازە ئیشـەکە هـاتبوو, ئەمە لە قـوڕنیچکەکي سـوڕاینەوە و ئەو خزمەن کو بە دە نەفەرانـی برنـدکەن و بە عـاردی دادەن ئەوهـا بەربـۆوە و کەتە ئەو

گۆڕەی بەس پیاو لۆ خوای برێ ئەو خزمەی من خرابتر وە عاردی کەت لە ژنەکەی، هاواری کرد و گۆتی ئەی بابە،

ئەمن بەس ما پێبکەنم و لە جێي خۆ چەقیم .

گۆتی: کوڕە هەی بێویژدان لۆ قیتم ناکەیەوە؟

گۆتم : خۆ لەسەرەمنت وە لێنەهاتیە تا قیتت کەمەوە، لەسەر ئەو ژنەت وەلێهات و با ئەو بێ قیتت کاتەوە.

گۆتی: بەخوای حەقی خۆم وەرگرت بە زیادەوەش، بەس ان شـأ الله گوناحم لەسەر ڕەشبویتەوە مادام هەر بەڕبوومەوە.

**** **** ****

*-وەختی خۆی سەیارە زۆرە کم بوون لە مەنیقەی کاروان و سەفەر هەر بە وراغی بوو ، وراغی چاکیش هێستر بوو بە مەرزیەی ئەلعان حسابەکرا.

خەرکی خۆشناوەتی بە زۆری کاروانی قارچاغیانە کردن ئی توتێ و لۆ موسر و مەخمور و قەراجی.

ئەوەی بڕەك گەنج و بە تاقەت با پارەکی چاکی وەدەستە کەت و هەتا پیرەکی کاروانەکە کرد ئەوی دووە کردن.

حاجی وەسمان بەگیش تازە جێبەك کڕبوو زۆری کەیف پێ دات و هەر جێبەکی گەیشتبایێ دەیگۆت : والله داکێ کاروانچیانم گا بە ئێکجاری باری دە ئێستران بارە کەم.

هەر یەکەم کاروانیش جێب و بار و سایەق گیران،ئەوجا کاروانچیان واگۆتێ ها حاجی وەسمان بەگ لۆ ئیوهە بێ کەیفی دەرێ ی بەزاوا نەبووی؟

**** **** ****

*-ساری ۱۹۸۷ بوو مارمان لە رانیەی بوو نزیك شاخی کێوەڕەشی، مارەکمان جیران بوو کورەکیان هەبوو ناوی سەردار خەرکی بیکێلی بوون، نیوڕانەکی پاشی نان خواردنێ گۆتن با بچینە سەر کێوەرەشی، وەرێ کەتین بڕۆ ،بڕۆ بووە نزیك مەغریب تا وەسەر کەتین، نە تەلەفۆن هەیە نە گۆتیتمان دەچینە شاخی، چ بکەین چ نەکەین تازە کەتنەکەمان کردیە، واشماندەزانی چوینە سەر مانگێ،هەندە کەیفن بە خۆدات و کەسیش نادیتین، گۆتم سەردار بچینەوە هیچ ئەوە لێدانن مسۆگەرە کەسیشن بڕوا پێ ناکات خۆ؟چ بکەین؟

گۆتی با هەردووك فانیلەی خۆ بەدارەکی وەکەین وەکی نیشانەکی و وەکی گەورە بووین جارەکی دی دێینەوە بزانین چی لێهاتیە، رێك وەکی ئەمەریکای کە چۆوە سەر مانگێ و ئارای خۆی لەسەر بەجێهێشت.

هەردووك فانیلەن لەبەر کرد بە دارەکن وەکدن و هاتینەوە، شەوێ درەنگ گەیشتینەوە ماری، جا بەخۆزانن چیان لێکردین، ئەوەی باسناکەم.

دوو سبەی وەختی نیوڕانێ چوومە مەلەی لۆ قولەی رانیەی، مەلەشم نازانی هەر لە تەنکاوان بووم و وەختەکی ئێکەکم دیت فانیلەکی وەکی منی دەبەردا بوو چوومە پێشی گۆتم ئەو فانیلەت لە کێ بوو؟ گۆتی: لۆ؟

گۆتم : هەروا.

گۆتی: دونێ خارم لە شاخی دیتیتەوە و دایە من لۆ خۆ ئیتو نیە؟

لە شەرمان گۆتم: هی منی چ ائەمن لۆ فانیلەی خۆ لە شاخی بە دارێ واکەم؟

**** **** ****

*-مەلا ئەحمەدي توتمە،هەموو ژیانی بریتی بوو لە قسەی خۆش و نوکتەو پێکەنین،

عەلائەدیناغەی کۆیێ،دۆستێکی نزیکی مەلا ئەحمەد بوو،ناوە ناوە سەردانی دەکردو دەچووە لای لەتوتمە،عادەتی وابوو عەبایەکی بەسەر ملاندا دەدا ئەسپێکی رەسەنی هەبوو،مەلا ئەحمەد حەفتەیەك بوو خێزانەکەی دوایی (مەلاژنە ئایش)کەزیاتر بە شێخزادە بەناو بانگ بوو،کچی شێخ کاکەمینی بلەی بوو،چوو بووە بلە،ئەویش لەسەر پێشەبانی خانوەکەی تەماشەی رێیێ ي دەکرد،سەروەختێك سەیری کرد لەرێي نزرۆکە بەدیار کەوت،زۆر کەیف خۆش بوو،وەی زانی مەلاژنە،کاتێك گەیشتە ناو گوندو چووە ماڵی مەلا ئەحمەدو لەقادرمان بەسەر کەت،پێش ئەوەی سەلام بکا،مەلا ئەحمەد کوتبووی،هەهۆ عەلادیناغا ئەوە ئەتووی؟ وەڵڵاهی خەنی بووم وەمزانی

مەلاژنە هاتەوە،عەلادیناغـاش زۆر تێـك دەچێ،چـاوەڕێ دەكـات تـاكوو تۆڵەی خۆی بكاتەوە،مەلائەحمەدیش بانگی یەك لەكوڕەكانی دەكات و دەڵێ(جەمال بڕۆ مریشكەكی لۆ عەلادیناغەی سەر ببڕە)،عەلادیناغاش فرسـەت دێنێ و دەڵێ (نانـا مامۆسـتا ئەزیەت مەكێشـە،ئەتوو هەمـوو وەختەكی لـۆمن مریشـكی) ،مەلا ئەحمەدیـش دەڵێ (وەڵڵاهی تـۆڵەی خۆت كردەوە).

**** **** ****

*- جـارێكی تـر عەڵادیناغـا لەلای مەلا ئەحـمەد دەبێ، پێش ئەوەی بـڕوا ئەڵێ(مەلا ئەحمەد ئەوا دەچمەوە كۆیێ،چت پێناوێ لۆت بنێرم؟

مەلا ئەحمەدیش ئەڵێ(كورتانەكن لۆ ئێستری لۆ بكڕە و لۆن بنێرەوە)

عەلادیناغـــاش ئەڵـێ (ئەدی قیاســی كورتـــانەكەی كـــووبی؟گەورەبی گچكەبی؟)

مەلا ئەحمەدیش ئەڵێ (قیاسەكەی هەربە پشتێ خۆبگرەو تەواوە).

*- رۆژێكیـان مەلایەكی خەڵكی دەشتی هەولێر دێتە لای ،دیارە ئەو رۆژە منـــداڵەكانی لەمـــاڵ نەبـــوونە،ئەو مەلایەش نەخۆشـــی مەعیـــددەی هەبـوە،مەلا ئەحمەدیـش بەخـۆی هەڵدەسـتێ هەنـدێك قەرێ سـۆر دەكـاتەوەو لەپێشـی دادەنـێ،مەلایەكەش ئەڵێ،ئەتـوو نزانـی ئەمـن مەعیـددەم تەواو نیە؟ئیـدی نـان و ماسـتی لەپـێش دادەنێ،دوای نـان خـواردن،مەلایەكە ئەڵـێ(وای مەلا ئەحـمەد جـارەكێش ئەتـوو رێـت

کەتبـــایە لای من،هەتـــا چ شـــتەکت نـــاخوارد لـــۆم دانابـــای)مەلا ئەحمەدیش ئەڵێ(وەڵلاهی ئەمن بەس گووی ناخۆم).

**** **** ****

*- جارەکیـان ڕیـش سـپیەکی شێخوەسـانان میـوانی دەبێ،کـابرا ئەڵێ (مامۆسـتا تەماشـاکە هەمـوو گونـدێ خۆشـناوەتێ یـان ئاغـا یـان بەگەکیـان هەیە،تەنها گونـدی شێخوەسـانان نەبی،ئەمە هـیچ بەگ و ئاغـان نیـنە)مەلا ئەحمەدیـش ئەڵێ(ئەدی ئەنگـۆش عەیشـەبەگتان هەیە).

**** **** ****

*-جارێکیـــان مەلایەکـی بـــرادەری دێتەلای،بـــۆ نـــوێژی مەغریـــب داوا لەمەلایەکە ئەکات کە دەبێ پێش نوێژیـان لۆبکـات،مەلایەکەش کـاتی خـۆی فەقێی مەلا ئەحـمەد بووە،ئینکـاری دەکـات کەچـۆنە بـی فەقێ پێشـــنوێژی لەپـێش مەلای بکــات؟ هەرچۆنێـك مەلایەکە پێشـــنوێژی دەکات،لەشـــەرمێ مەلا ئەحـــمەدی لەرکـاعەتی یەکەم دوای فاتیحـــا سـورەتی قـول ئەعـوزێ گچـکە ئەخـوینی،مەلا ئەحمەدیـش هەرلەنـاو نوێژدا ئەڵێ(دەستت لەو گونەی ئەدی لۆ رکاعەتێ دووەم چەکەی)؟.

*-عەیزبەگی تـوتمە چـاوی کزبووبـوون،مەلا ئەحمەدیـش گـوێی گـران بوون،واتا(کەڕ)بوو،لەترســـێ بۆردومـــانی تەیـــارە رۆژانە لەگونـــد دەردەچوون،مەلا ئەحمەد بەعەیزبەگی گوتبوو( ئەگەر دەنگی تەیارەی هەت ئەتوو بەمن بڕێ،ئەگەر ئەمنیش دیتم ئەوا ئەمن بەتووەڕێم).

*-مەلا ئەحمەد عادەتەکی هەبوو،شەو زوو دەنووست و بەیانیانیش زوو هەڵدەستا،شەوێك مێوانی هەبوون،ئەویش کە سعات بوو بە نۆی شەو دەڵێ جێیانم لۆ رایێخن ئەمن ئەنووم،برادەرێکی ئەڵێ (مەلا ئەحمەد هێشتا زووە خۆ مریشك هێشتا نەنووستینە،ئەویش ئەڵێ (نووستنەکە باشترە لەچەغەتوولانێ)،چەغە توولانە واتا رەوینی رەوە سەگ.

**** **** ****

*-میرانی جەمیل بەگی مەلۆکی سوعبەتی هەبوو لەگەڵ مەلا ئەحمەد،دیارەبووە کەخێزانی میرانی جەمیل بەگ گوێي گران بووین،باپیریشم بەهەمان شێوە،

میرانی جەمیل بەگیش بەمەلا ئەحمەد ئەڵێ (مەلا ئەحمەد ژن گوێي گران بن باشترە لەپیاوی)

مەلا ئەحمەدیش ئەڵێ (نەخێر پیاو باشترە گوێي گران بن،چونکە ئەگەر بەژنێ برێي هەستە ئاوەکم لۆ بینە،ئەو لەبەر ئەوەی تێناگا یەکسەر دەرپێێ لەپێکا،وائەزانی دەعوای هەندێت لێکردیە)،

میراني جەمیل بەگیش ئەڵێ (وەڵلاهی مەلا ئەحمەد کەست لێناباتۆ).

*- مەلایەکی برادەری هەبوو لەبادینان،سەردانێکی مەلا ئەحمەد دەکات ئەویش پێی دەڵێ مەلا ئەحمەد ئەوا دەگەڕێمەوە بادینان چت پێناوێ؟مەلا ئەحمەدیش پێی ئەڵێ(ئەڵێن لەبادینان گەنم هەرزانەو هاتە،وەکی هاتیەوە هەندەك گەنم لۆ دەگەرە خۆ بینە،وەکی

هـاتیەوەش هەنجیرو تـرێ و هەنـاران لەگەڵ خـۆت ببەوە،مـاوەیەکی زۆری پێدەچی ئنجا مەلای بادینـان دێتەوە،دیارە ئەو کاتە وەختی تـرێ و هەنجیـري بـووە،بە مەلا ئەحـمەد ئەڵـێ (پـێم نەکـرا بتگەینمێ)مەلا ئەحمەدیش ئەڵێ(ئەتوو پێنەکرا ئەمن ئەگەینمە توو).

**** **** ****

*- مەلا ئەحمەدلەگونـدێك فەقێ بووە،دیـارە حەزی لەکچێـك کـردووە نـاوی(رابي بووە)،دەبـوایە لـۆ هێنـانەوەی راتـبە چووبـانە پـێش هەنـدێ مـاڵ،ئەوانەی خـوا پێـداو بـوون،لەپێش مـاڵەکە ئەیـان گـوت (راتبێ رەحمەت و لێبی) ،مەلا ئەحمەد ئەگەر سرەی بایە،دەچووە پێش ماڵی رابی و ئەي گۆت (رابی ئەحمەدت لێبیا)،کچەکەش ئەی گۆت ماشـەڵڵا خۆش وارێ،ئەوە راتبە هینانەوەیە.

**** **** ****

*-جارێك کابرایەکی برادەرێئەبێ بە مەلا ئەحمەد دەڵێ:-

ئەتوو لۆ هەندەت مەلاژن خۆش دەوێ؟

ئەویــش وەڵامـی دەداتەوەو ئەڵـێ: ئەوەی مەلاژن ئەمداتێ،ئەتووشــم بدەیێ خۆشمەوێی.

*-هەمـوو سـاڵێك جـاران عـادەت بـوو دەبـوایە مەلاو ردێـن سـپي و پیـاو ماقولەکان چووبانە هەورامان،خزمەت شێخ عەلائەددینی بیارەی،

مەلا ئەحمەدخـاڵی شـێخەکانی بالیسـان بوو،سـەفەرەکێ رەحمەتـی (شێخ عومەر شێخ تەهای بالیسانێ)ئەڵێ:

خاڵە ئەمەش هەر شێخین لۆنابیە دەروێشی مە؟

مەلا ئەحمەدیش ئەڵێ:

ئاخر خوارزا کوو دەبی ئەمن ژنم شێخ بێ ببمە دەروێشی شێخان؟.

**** **** ****

*-جارەکیـان مەلا ئەحـمەد بەسـەردان ئەچیتە گوندی سـەران،گوندی سـەرانیش جێیەکی بەرزە،کەئەگاتە جێ،لەمزگەوتێ گوندی لادەدا بـۆ نوێژکردن،چـونکە وەختی خـۆی خەڵکی ئەو گونـدە زۆر هـاتبوونە لای مەلا ئەحمەد،یەکەکیـان دەسـتی مـاچ ئەکـات و ئەرێ نەمناسـی مامۆستا؟،ئەرێ نەوەڵڵا.

ئەویش ئەڵێ ئەمن جومعەمە،

یەکی دی دێـت ئەڵێ ئەمـیش نەناسـی؟ مەلا ئەحمەدیـش ئەڵێ وەڵـڵا ئەگەر شـەموو بێ.

دوای نـوێژ کردنـێ ئەچیـتە مـاڵی یەکێـك لە شـێخەکان،دوای بەخێـر هینـان ،مەلا ئەحـمەد ئەڵێ: وەڵڵاهی یاشـێخ ئەنگۆ جێـو هەنـدی برنـدە زۆر لەخوای نێزیکن،لەوانەیەخوا زوو و عەفووبکات.

*- جارێکیـــان مەلایەکــی خەڵکــی دەشـــتی هەولێـــری دێـــتەلامەلا ئەحمەد،ئێـوارێ مەلایەکە ئەڵێ مەلا ئەحـمەد دەبا پیاسـەکێ بکەین لۆ دەرەوەی گونـدی،ئەو کاتی گاراِنی گوند دێتەوە،مەلایەکەش ئەڵێ مەلا

ئەحـــمەد ئەو هەمـــوو وراغە ئـي كێــنە؟،ئەویش ئەڵـێ ئەوە گـاڕانێ گوندیە،سـبەینان گاوان دەیـان بـاتە دەشـت و دەرو ئێـوارانیش دەیـان هینیتەوە گوند،مەلایەکە ئەڵێ چەند سـەر دەبن باپیریشم ئەڵێ نێزیکەی ٢٥٠ سـەر دەبـن،مەلایەکە ئەلێ مـانگێ بەچەنـدیە؟مەلا ئەحمەدیـش ئەڵێ هەر تاکێك بەمێ درهەمانەو مانگێش هەرسـەری دەبی دوو نانان بدەن،پێی ئەرێن نانی گاوانی ،

مەلایەکە ئەڵێ وەڵلاهی مەلا ئەحـمەد بەخـۆم دێم دەبـمە گاوان ،ئەوە پارەیەکی باشـە.مەلا ئەحمەدئەڵێ ئەو ئیشە بەتوو ناکرێ.

مەلایەکەش ئەڵێ لۆ پێم ناکرێ؟

مەلا ئەحمەدیـش ئەرێ خـۆ دەشـتێ هەولێرێ نـیە ئەوجـا مـاکەر دەگەر گاڕانێ دابن،ئەنگۆش بەبێ ماکەری گاوانی و پێناکرێ..

* * * *        * * * *        * * * *

*-جارێکیـان مەلا ئەحـمەد لە پـێش مـزگەوت دانیشـتووە،دوو مێـوان دێـــنە لای و دەســـتی مـــاچ دەکەن،دوای بەخێــر هێنان،لەیەکیـــان دەپرسێ،خەلکی کوێی؟ ئەویش ئەڵێ: خەڵکی لاسـەم.

لەوەی دیکەشـــە پرسـێ:ئەی تـۆ؟ ئەویــش ئەڵـێ :خەڵکـی لاســە،مەلا ئەحمەدیش ئەڵێ: کەواتە بەهەردووکتان سـەیەکی تەواون،لاسە لاسە.

*- جارێکیـان لەگەڵ نوری بەگی توتمە کە وەرداش زاوابوون،بەیەکەوە ئەچنە گونـدی(بلەی ژۆری) مـاڵە خەزوران،ئەوکاتیش مـاڵە شـێخەکانی بـلەی ژۆری قەرەبـاڵغ بـووەو چەنـدین کەسـایەتی لەوێ بوونە،یەکێـك

لەوانە

(شـێخ برایمـی برادۆسـتی) بووە،خـوارزای (شـێخ نەجیم)بـوو،لەوێ بووە.دوای نـانخواردنی ئێـوارەو هەتـا درەنـگ دانیشـتن،وەختی نووسـتنی شـێخ نەجـیم بە شـێخ بـرایم ئەڵێ: وەرەلەلای مـن بنوو،خـوارزا،مەلا ئەحمەدیش ئەڵێ: لێی گەڕێ پێم خۆشـە بەیەکەوە بین،ئیدی شـێخیش دڵی بـاپیرم ناشـکێنێ ،کاتێ کەشـەو ئەچـنە نـاو جێگـای نووسـتن،مەلا ئەحـمەد ئەڵێـتە شـێخ بـرایم، کـاکۆ حەیرانـان نزانـی ؟ ئەویـش ئەڵێ نـابەخوای مامۆسـتا ،مەلا ئەحمەدیـش زۆری لێئەکـات و حەیرانێکـی پێـدەڵێ،دوای تەواو بـوونی حەیـرانەکە،مەلا ئەحـمەد ئەڵێ:سـبحان الله خوایە لە ئیش و کارت،ماڵە شێخێ بلەی وەکوو (بنی اسـرائیلیان)هەموو جۆرە کەسێکیان هەیە،لە مەلا لەبەگزادە،لە حەیران بێژ.

**** **** ****

## خدری بەرخی و میرکچ ...

...لە دەڤەری بیتوێن، کە وەرزی بەهار دەهات، کچە ئاغایەک پێنج شەش کچی ناسک و جوانی وەگەر خۆی دەداو بۆ سەیران و خۆشی دەچوونە دەشت و دەر، کاتێ پیاوێکی گەنج یان کوڕێکی گەنجیان بەتەنها ئەدیت، ڕێگایان لێدەگرتن و پێیان ئەوت: ئەگەر پیاویت دەست بکەرەوە! ئەگەر دەستوەکەری کردبا، بە هەموو کچان لێی دەئاڵان و ئەوەندەیان بە سەرکە ئەستری خرپی نووک تیژی درکاوی لێدەدا، هەتاکو دەیان خستە گۆڕێ، ئەوجا جلوبەرگیان لەبەر دەکرد و هەوەس و کۆڵی دڵی خۆیانیان پێ دەڕشت و دواتر بە جێیان دەهێشت. ئەگەر دەستی نەکردباوەو دەستوەکەری نەکردبا، بە ئاسان خۆی دابایە دەستیان، ئەوە بۆ کچەکان زۆر ئاسانتر بوو. خدری بەرخی کوڕێکی گەنج بوو، ڕۆژێک لە چۆڵگەیەکدا لە دەشتی بیتوێن، کچەکان ڕێگای لێدەگرن و پێی دەڵێن: ئەگەر پیاویت دەست بکەرەوە، خدر کوڕەکی چوارشانەو زبر بوو وتی: کامەتان میر کچە؟ میر کچ خۆی ناساند و خدر خۆی لێ نزیك کردەوە و لە پڕێك باوەشی لێداو لەسەر شانی داینا و هەڵات، میر کچ زۆری لە سەر و ملی خدردا ، و خێرا بوو، هەموو کچەکانی بەجێ هێشت و کچەکان هیلاک و شەکەت بوون کە تەمایان لێنا گەورە کچیان پێ ناسێنرێتەوە، بە ناچاری لە دوایان بوونەوە، خدر کە گەیشتە شێنەیی، لە نێو کەندرێکدا، میرکچی لە سەر شانی هێنایە خوارێ و ئەوەی حەزی لێ بوو لە گەڵیدا کرد و کوڵی خۆی لێ ڕشت، ئەوجا پێی وت: فەرموو بگەڕێوە لای هاوڕێ کچەکانت، میرکچ ووتی: بۆ کوێ بڕۆم؟ بە چ ڕوویەك بگەڕێمەوە لای کەس و کارەکانم؟ لە گەڵ خۆم ببە و مارەم بکە و بمکە هاوسەری خۆت، خدر

دەستی میرکچی گرت و گووتی: شەڕو نیوە شەڕ هەریەکە، بەڕێکەوتن بەرەو گوندی هەرتەل، کاتێ گەیشتنە گوندی هەرتەل، کەس و کاری خدر مەلایان هێناو خدر و میرکچیان لە یەکتری مارە کردن، باوکی میرکچ کە بەسەرهاتی کچەکەی بیست! دوای شەش حەوت ڕۆژ لە دوای خدری نارد و خدریش بە دوای داواکەیەوە چوو و بێ کەم و زیاد ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە، ئەویش پیرۆزبایی لێ کرد و پێی گووت: گۆشت قابیلی بازە...

**** **** ****

## ڕاوچییەکی فێڵباز...

خدرەفەندی ڕاوچییەکی لێهاتوو لێزان بوو، بزنە کێوییەکی ڕاوکردبوو و کەوڵی کردبوو، کاتێ کە دەچووە شاخ بۆ ڕاو، کەوڵە ئاسکەکەی لەگەڵ خۆی لە نێو تورەکەیەکدا ئەبرد، ئەگەر هیچ بزنە کێوییەکی دەست نەکەوتبایە، دەچوو لە نزیك مێگەلە بزنێکی ماڵی خۆی مات دەکرد و کە شوان تێدەپەڕی، لە دواوەی مێگەلەکە، بزنێکی دەگرت و بۆ ئەوەی نەباعێنی، بەتوندی لوتی دەبەست و لە نێو کەندڕێکدا دەیکوشتەوە و پێستەکەی لێ دادەماڵی و فڕێی دەدا و کەوڵە بزنە کێویەکەی لێ دەئالاند و هەڵی دەدا سەر شان و دەیبردەوە ئاوایی و ماڵێ خۆی، خەڵکی کە دەیانبینی وایان دەزانی بزنەکێوییەکی ڕاوکردووە، ڕۆژەک بەو شێوەیە بزنێکی (حەیشەکدوی) کوشتەوە، شوان ئاگای لێ نەبوو، ئێوارە داهات شوان و مێگەلە بزنەکەی لە شاخ گەڕانەوە

ئاوایی و ماڵی حەیشەکدو، حەیشەکدو چووە ناو بزنەکانی و هەستی کرد بزنێکی نەهاتووەتەوە، بەشوانەکەی وت: بزنێک دیار نەماوە، چی بەسەر هاتووە؟ شوان بێ ئاگایی خۆی دەربڕی، حەیش وتی: شکم لە خدرەفەندییە! دەکرێ ئەو کوشتبێتیەوە، هەستا چووە ماڵی خدرەفەندی و بەردەرگای لێگرت و وتی: خدرەفەندی وەرە دەرێ! بزنێکم دیار نەماوە، خدر وتی: چی بکەم بۆ ئەوەی گومانت لە من نەمێنێ؟ حەیش وتی: سوێندم بۆ بخۆ، خدرەفەندی وتی: بەیانی دەچینە لای مەلاخدر، لەلای ئەو سوێندت بۆ دەخۆم، شەو داهات، خدرەفەندی چووە ماڵی مەلاو ڕانە گۆشتێکیشی بۆ مەلا لە توورەکەیەکدا برد و پێی ووت: ڕوداوێکی بەو شێوەیەم بەسەرهاتووە، چارم چییە؟ مەلا وتی: حەیشەکدو ژنێکی خۆش باوەڕ و ساویلکەیە، بەیانی هەردووکتان وەرن و منیش سوێندت دەدەم و بەم شێوەیە سوێند بخۆ (قورئان بە حەقت بە ساحێبت، دەستنوێژم لە بزنا حەیشەکددوێ نەشکایە)، ئەو کات حەیشەکدو هیچی لە بەر دڵ نامێنێ، تۆش سوێندت لێ ناکەوێ، خدرەفەندی گەڕایەوە ماڵ و بەیانی لەگەڵ حەیشەکدو هاتنە لای مەلا، وە ژوور کەوتن و سەلامیان کرد و مەلا یەك پێ لە بەریان هەستا و بەخێری هێنان، حەیشەکدو کەوتە قسەو گوتی: مەلا، بزنێکم لێ دزراوە شکم لە خدرەفەندییە و دەمەوێ سوێندم بۆ بخوا، مەلا ووتی: خدر بڕۆ دەستنوێژ هەڵبگرە، خدرەفەندی دەست نوێژی هەڵگرت و مەلا بەو شێوەیە سوێندیدا ( قورئان بە حەقت بە ساحێبت، دەستنوێژم لە بزنا حەیشەکدوێ نەشکایە)، حەیشەکدو کە ئەمەی بیست، بیری لەوە نەکردوە کە دەستنوێژ لە بزن ناشکێك، هەستا سەرێ و باوەشی لە خدرە فەندیدا

و ئاولاولاو ماچ کردن و ووتی: ئەی بە قووربانت بم براله، دڵم له تۆ خاوێن بۆوه، گەردنم ئازاد بکه...

**** **** ****

**جندرمه و جاشوله ...**

لەسەر دەمی عوسمانییەکان، وەختێ که له کوردستانی باشوور دەستەڵاتداربوون، بارەگایەکی (جندرمه) له نزیک ماری مام سادق بوو، رۆژێک مام سادق سواری گوێدرێژەک بوو بوو، جاشوولەیەکیشی بە دوو خۆیدابوو، بە پێش بارەگای جندرمەکاندا دەیویست تێپەڕێ، جندرمەکان که چاویان وە جاشولەکه کەوت! ئارامییان نەما و تەشقەڵەیەکیان بە مام سادق کرد و جاشولەکەیان لێ ستاند، له نزیك ئاوایی له پێش چاوی مام سادق! بەبێ شەرمی وەبەر جاشولەکه نیشتن!! مام سادق بەو کاره زۆر درگران بوو، چووه لای (قوماندار) که لێپرسراوی جندرمەکان بوو شکات بکات، پێی گووت: گەورەم، پیاوەکانی تۆ جاشولەکەیان لێ ستاندم و هەر له پێش چاوی منیش وەبەری نیشتن، قوماندار پێی گووت: (جندرمه ژنی نییه، من نەگێ و تۆ نه گێ و چاشکه ماکەر نەگێ، ئەی چی بگێ؟ قونی خۆی بگێ!)، مام سادق که ئەمەی بیست، بە بێدەنگی بەدرەکی پڕ لەخەفەت گەڕایەوه مارێ...

## کەری مەلا سابیر ...

مەلا سابیر کەرەکی هەبوو، هەموو ڕۆژێ مێخ زنجیری هەردەقەند و بەرهەڵدە بوو و دەچووە ناو توووتن و تەماتەی خەڵکی، بەس چ چوونەک! ئەو پارچە تووتنەی ئەچووە ناوی، وێڕای ئەوەی کە سەر و چووتەی لە تووتنەکە هەڵدەبڕی و دەیکرۆشت، پەلکەکانیشی بە هەر چار لاقان دادەڕنی و دەیشێلا و خەساری دەکرد، بەڵایەك بوو لۆ ئەو گوندەی، شەوەکێ مەلا سابیر دەچی کا و ئالیکیە داتە کەری، جغارەکیشی بە ئاگرەوە لە دەوی گرتبوو، جۆڕکی کەرەکەی پڕ لە کاو ئالیک کرد بوو و ئاگری جغارەی هەروەرابۆ ناو جۆڕکێ، ئەویش ئاگای لێنەبوو بوو، کا و ئالیکی بە سەر و لووتی کەرێ وەکردبوو و بەبێ خەمی چووبۆوە ماڕێ لێ نوستبوو، سبەینی وەکی لە خەوێ هەستابوو گۆتبووی: با بڕۆم کەری ئاودەم، وەکی کەری دیتبوو چ دیتنەک! سامی ڕێنیشتبوو، دەوو لووتی کەرێ هەموو سۆتابوو، کەرپی گرو گەورەی دەرکەوتبوون، پێست و گۆشتی دەوو لووتی، هەمووی تاوابۆوە، بەشەری لێ ئەترسا. بەس کونە چاوی دیار مابوون، کەرەکە لە تاو سۆتانی خۆی، وەختێ کا و ئالیک ئاگری گرتبوو، خۆی ڕاپرچکاند بوو، بەرا بێسوود بووە، خوا ڕوحمی پێکردبوو وەختی ئاگر گەیشتبۆ بنی جۆڕکێ، بنی سۆتابوو، هەموو کا و ئالیک ڕژا بوو، ئەگەرنا هەموو کەلەش و تەویلەکەشی دەسۆتا. کەر ماوەیەک لە ماڕێ کەت، هەتا دەوو لووتی بە زەبری دەرمانی خۆماری، تەنکە پیستەکی گرتەوە و باشبۆوە، خەڵکی گوندی نزایان ئەکرد چا نەبیتۆ، بەرام نزا دادی نەدا، جاران بەس سەر و جووتەی لە توتنێ هەڵدەبڕی و پەلکەکانیەشێلان، پاش ئەوەی کەر چابۆوە، درانی ئەوەندە دەرکەوفتن، زۆر لەبار بوون

بـۆ سـەروجووتە هەربڕینێ، هەر ئەوەشـنا! وەکـی بەر هەر ئەبـوو و ئەچـووە نـاو تـوتنێ، کەرپەکـانی لە قـالۆڕان گیـر ئەکـردن و لە ڕێیـانی هەرەقەناندن، خەڵکی ئەیانگۆ بریا هەر وەکی جاران بایە، وەکی بەس سـەر و جـۆتەی هەرنەبـڕی و پەلکیەشـێلان... ئێسـتاش لە گونـدی، هەرکەس درانی ئەگەورە بن، پێی ئەڕێن: دەڕێی کەری مەلا سابیری...

**** **** ****

## مەدۆ ڕاسپاردەکەی (باراماغا)ی لەیاد نەما...

باراماغـا کـارەکەرێکی غەریبحـاڵی هەبـوو نـاوی مەدۆ بـوو، سـبەینەکی ووتی: مەدۆ برۆ لای عەوڵاغـای پێی بـرێ باراماغـا ئەحـواڵی پرسی و ووتی دووزبەی دەعوەتی منی چاوەڕێتەکەم. مەدۆ وەڕێکەت، نیوڕانێ گەیشتە ماری عەوڵاغای، مەدۆ لەبیری چوو لۆ هاتبوو. عەوڵاغا لێی پرسی ووتی: مەدۆ لـۆ هـاتی؟ مەدۆش ووتـی: نـازانم! عەوڵاغـاش ووتـی: کـوو نـازانی؟! ئەدی نـابی بـزانم لـۆ هـاتی؟ مەدۆش هەر واگـۆ نـازانم، عەوڵاغـا ووتـی: ئەمن ئەزانـم باراماغـای لـۆ نـاردی، بـاگوردانەکی لەکنەمنە ئەتـووی لـۆ ئەو بــاگوردانەی نــاردیە. مەدۆی فەقیـر نیــوڕانێ نــانی خـــوارد و باگوردانیان هەردا سەر پیلی و وەڕێکەت، لەڕێێ هەر قنە قنی بوو لەو گونـدی لـۆ ئەو گونـدی هەتـا گەیشـتۆ مـارێ باراماغـای و ئێـوارەش داهات. باراماغا وەکی دیتی مەدۆ باگوردانی وێیە پێکەنی و لێیپرسی: ئەو بـاگوردانەت لـۆ هینـایە، خـۆ ئێسـتا هـاوینە بـاران نابـاری، دەڕێـی سـەربانتان درۆپەیەکـا. مەدۆش ووتـی: درۆپەی چ و حـاری چ، ئەمـن

وەختە شانم بشکێ. باراماغا ووتی: دەی پێم بڕێ ئەتوو بەو هاوینەی ئەو باگوردانەت لۆ وێیە. مەدۆ ووتی: چوومە کن عەوڵاغای، لێی پرسیم لۆ هاتیمە، ئەمنیش وەمگۆتێ نازانم، ئەویش ووتی: ئەزانم باراماغای لۆ ناردی، باگوردانی لەکنەمنە ئەتووی ناردیە لۆی ببەیۆ، بە دوو نەفەران باگوردانیان هەردا سەر شانی من و بە قنەقن هینایتمۆ ئێرە. باراماغا ووتی: کوڕە مەدۆ فێڕیانا لێکردی، باگوردانی من گەلەک لەوەی گەورەترە، بڕۆ باگوردانی خۆمم لۆ بینۆ. سبەینێ دەگەر تاریک و ڕوونی بەیانی، مەدۆ بە باگوردانەوە وەڕێ کەتەوە لۆ ماری عەوڵاغای، وەکی گەیشتێ ووتیە عەوڵاغای: ئەوە باگوردانی مە نیە، فێرت لێکردینە، باگوردانی مە زۆر لەوەی گەورەترە، عەوڵاغاش بە پیاوی خۆی گۆ: بچن کەهە باگوردان لە ئاواییێ گەورەیە لۆی بینن و لەسەر پشتی مەدۆی دانێن. وەکی هینایان وە مەدۆیان داو بە کندرەکی پێچایانۆ. مەدۆ وەڕێ کەت و خەڵکیش پڕ بە زار پێی پێئەکەنین، مەدۆی فەقیریش نەیەزانی کەر لەکێ کەتیەو کوندە لە کێ دڕایە، گەیشتە ئاواییێ خۆیان و چۆوە ماری باراماغای، باراماغا ووتی: یاخوا بەخێربێیەوە مەدۆ، ئەوە باگوردانی منە، عەوڵاغای ئەویست فێرێم لێبکا.

**** **** ****

## حەمەشەپە دەیەوێ کنێر ڕاو بکا...

کنێر کچێکی جوانی تازە پێگەیشتووی قسەخۆش بوو ووتی: چار پێنج چێرمان هەبوون، بابم هەموو سبەینان ئەمنی هەرەستاندۆو ئەمنیە نارد بچم بیانبەمە لەوەڕی. سبەینەکی مانگام لێئەخوڕین، لە گوندی وەدوور کەتمۆ ، چاوم هێشتا خەواڵی بوون، ئاوڕەکم داوە پیاوەک بە مشاوەشی وەدووم کەتبوو هابمگاتێ و نەمگاتێ، پێیانەگۆ حەمە شەپە، گۆتم : شەپە لۆ هەندە مشاوشی وەیگۆ: لۆ توو مشاوشم. گۆتم: قاچینە قوونێ قورتار کەن. غارم دا هەر ئەوەندەی وێڕاگەیشتم وەسەر دارێ کەوم، شەپەش هاتە بن دارێ شروال و بێجامەی لەبەر کردنو بە گون ڕووتی لۆم هات، هەر پێش ئەوەی بمگاتی خۆم فڕەدا خوارێ و شروال و بێجامەم بردن و هەراتم، حەمە شەپەش خۆی فرەداو بە گوون ڕووتی وەدووم کەت و هاواریەکرد: هەی بەقوربانت بم کچەتیمێ کنێر، هەر چ نەبی بێجامەم لۆ فڕەدە، حەیام چوو. ئەمنیش گۆتم: هەتا تۆبەی نەکەی وێت نادەمۆ، شەپەش ئەیگۆ: تۆبە هەتا مایمە جارەکیدی ئەو کارانە ناکەم. لە گوندی نێزیک کەتینۆ شروال و بێجامەم لۆ فڕە دا و چوومۆ مارێ بەرا لە مارێ باسم نەکرد.

* * * *　　　* * * *　　　* * * *

## مام وسووی وەجاخ کوێر بەهیوای منالێک بوو...

مام وسوو پیاوێکی ئیختیار و وەجاخ کوێر بوو، لە ژیانیدا دوو ژنی هێنابوو بە هیوای ئەوەی خوا منالێکی پێ ببەخشێ، کەچی ئەو هیوایە نەهاتە دی. مام وسوو ژنی یەکەمی ناوی هەوری بوو، ڕۆژێک هەوری ووتی: وسوو زگم دەجوولێ، پێ دەچێ منالم لە زگ دابێ. وسوو گوتێ: مزگێنیت کەت و مانگای زەردیشم خێر بی. وسوو مانگای زەردی کوشتەوە و دابەشی کردە سەر دراوسێیان. ڕۆژەک هەوری ووتی: وسوو، زگم هەر گەورە دەبی دەچمە لای مامان بزانم چەند مانگم مایە مندالم بی. مام وسووش ووتی: زۆرم پێخۆشە، بچۆ. هەوری چووە لای مامانی و مامان پێی ئەرێ ئەوپەڕی دوو مانگی مایە، هەوری لە خۆشیان شای بە سەپان نازانی بە خۆشی گەڕاوە ووتی: وسوو، مامان ووتی: ئەوپەڕی دوو مانگم مایە. وسوو لە خۆشیان ئیشی ناو مارێشی بە هەوری ناکرد، هەموو ئیشی بەخۆ ئەکردن، دری نەدات هەوری مانديکا. ڕۆژەکی هەوری و مام وسوو دەچنە ماری خزمەکی لە گوندەکی دی، کەرەکیان پێبوو، وسوو ووتی: هەوری ئەتوو سواری کەرێ بە نەکوو هیلاک بی، ئەمنیش لە پێشەوە قەڕاسی کەربەگرم. وەختی ئەگەیشتنە کۆسپەکی یان چارەکی، وسووی توند قەڕاسی ئەگرت نەوەکی تاسمەکی بکا منالی هەوری لەبار چی. سەردانیان تەوەوکرد و گەڕانۆ هەوری هەر منالی نەبوو، دەرکەت زگ گەورەبوونەکەی ئی قەرەوبوونێ بوو نەکو منال. پاش چار ساران هەوری مرد هەر منالی نەبوو. مام وسوو ژنەکی دی هینا ناوی خەیال بوو، بە تەمەنی حەوتا سالیش مام وسوو دەیگۆ: هەسپم هێشتا هەر بەکارە، بەشکەم ئەوجارەی منالەکم بی." کەچی ئەو هیوایەشی هەر نەهاتە دی.

## مام قادرو مام ڕەحمان تاڵان و ڕووت و قوت دەکرێن...

مام قادر و مام ڕەحمان دوو پیاوی هەژار بوون، کەسابەتی ساریان یەکی دوو فەردە تووتن بوو. ڕۆژێک تووتنەکەیان دادەگرن و یەکی کەرەکیشیان هەبوو تووتنەکەیان لە کەرێ بارکردو وەڕێکەتن لۆ کاروانەکی دەدوازدە ڕۆژان چاویان وە مار و منالی خۆ ناکەت، مارو منالیش چاوەڕێیان بوون هەتا جلک و پێڵاو و خواردنیان لۆ لە شاری دینن. کۆمەرە چەتەیەک لە چۆرگەکی ڕێیان لێئەگرنو توتن و کەریان لێئەبەن و لەوێ ڕووتیانەکەنۆ و یەکی شاپەکیشیان لە قوونێ ئەدەن و ئەڕۆن. مام خدر و مام ڕەحمان زۆر بە خەمباری ئەگەڕێنۆ مارێ، زۆر هیوایان بەو تووتنەی هەبوو، ئەویشیان لێ ستیندرابوو، بێجگە لە هەندێش کورتەل و شەروار و کەراس و دەرپێشیان لە پێ کردبوون. لە ڕێێ ئەگەنە گوندەکی لەلاپەڕگەی گوندی ژنەک دانیشتیبە ئەوانیش بە ڕەق و ڕووتی بەرەو ڕووی ئەڕۆن و ژنەکەش هەراتە ژۆرێ کە بە ڕوتو قوتی بینین ترسا، زوو دەرکەی قەپات کرد. مام قادر و مام ڕەحمانیش چوونە پەنا بەردەکی بەس سەریان دیاربوو، هاواریان کرد: براژن خوا خێرت بنووسی یەکی بێجامەکن لۆ بینە، چەتان ڕووت کردینۆ. ئەویش ناوێرا، لێیان ئەترسا. لەو بەینەی مێردی ژنەکەی هاتۆ، ژنەی دەرکە کردۆ و ووتی: پیاوەکە ئەوە لە کێ بووی؟ ئەویش ووتی: لۆ چبووە؟ ووتی: ئەو دوو پیاوەی لە پشت ئەو بەردەینە هاتبوون لە توم بستێنن، بە ڕووت و قووتی لۆم هاتن. (ئاش لە چ خەیارەکی و ئاشەوان لە چ خەیارەکی). ئەوانیش هەر هاواریانەکرد: لۆ خاتری خوای یەکی بێجامەکمان لۆ بینن. مێردی ژنێ چوو وەکی دیتی لە پشت بەردی دەستەکیان لە پشت قوونێ خۆ یەکەکیش لە پێش گونی ڕاگرتبوو و

زۆریان شەرمەکرد، ووتی: ئەوە چتان بەسەر هاتییە؟ ئەوانیش لۆیان گێڕاوە، ئەویش چوو هەریەکەو بێجامەک و کورتەکی لۆ هینان، ئەوانیش دەبەریان کرد و ووتیان: ڕەبی خوا خێرت بنووسی. ئەجە ملی ڕێیان گرت و بە ڕێی خۆدا گەڕانۆ بەرەو گوندی و ماریێ خۆ...

**** **** ****

## گوڵزار دری موسای دەست گیر انی ڕەنجاند...

مووسا کوڕەکی گەنجی دەستگیراندار بوو. زۆربەی شەوان بە گەڕان ئەچووە ماری گوڵزاری دەستگیرانی، هێندەی شایی پێ بوو خۆی بە کەس نادا. شەوەکی مووسا ئەچیتە ماری گوڵزاری و سەلامیان لێکا، گوڵزاریش جوابی سەلامیەداتۆ و ئەرێ: موسا بەخێر نێی! قوڕە بێتامت کردییە، هەموو شەوێ دێیە گەڕانێ، خەوت لێ حەرام کردینە. موسا ئارەقەی کرد و لە ناو خۆیدا زۆر پەست بوو، یەکسەر گەڕاوە مارێ، بە حیسابی خۆی ئەوە دەستگیرانیتی هاتیتە کنی دەبی شایی پێ بێ، بەو شەوەی خەم گرتی و چوو لە پەنایەکی دانیشت. بابی نەمابوو برا گەورەیەکی هەبوو ناو علی بوو علی هات و لێی پرسی: موسا لۆ وا عاجزی؟ موسا ووتی: گوڵزار پێی وتم: موسا بەخێرنێی قوڕە هەموو شەوێ لۆ دێیە گەڕانی، ئەو قسانە ئەمنی عاجز کردییە، هەر یەکسەر هاتمۆ مارێ. علی ووتی: ئەی لە کاکت نەکەوی، ئەوە کەنگین کێشەیە، چ زۆرە ژن زۆرە، هەر ئەوشەو لۆت ئەچمە داخوازی کچێ مام باپیری و لێت مارا کەم و لۆشتەگوازمۆ. علی برادەرەکی هەبوو ناوی باپیر بوو زۆری خۆش ئەویست کچەکی هەبوو ناوی ئەستی بوو، هەر بەو شەوەی علی چووە ماری ووتی: باپیر، موسای برام ئیوەهەی لێهاتیە

هـاتیمه ئەسـتی کچـت لـۆ موسـای بخـوازم، مـام بـاپیر گۆوتی: ئەسـتی، کچـم، شـوو بە موسـایەکەی؟ ئەسـتی ووتـی: بـاوە ئەمـن لە قسـێ تـوو دەرنـاچم. بـاپیر ووتـی: مـادەم وایە علی، ئەسـتی پێشـکەش بە موسـای برات بێ. علی ووتی: هەر ئەوشـەوێش لێکیـان ماراکەین. باپیر ووتی: کوو ئەبی داخـوازی و مارەبڕین لە یەک شـەوی بی؟ علی ووتی: ئەگەر ئەمنت خـۆش بـوێ ئەبـی و ئەکەیـن. بـاپیر ووتـی: درت ناشـکینم، چـوون بەو شـەوەی لەدوو موسـاو مەلایـان نـارد و موسـا و کچی مـام باپیریـان لێک مارە کردن. علی ووتی: مام باپیر، داوایەکی دیشـم هەیە، با هەر ئەوشـەو بشـیگوازینۆ! مـام بـاپیر ووتـی: نـاخر کـوو ئەبـی داخـوازی و مـارەبڕین و گواسـتنەوە بەیەک شـەوی بی؟ علی ووتی: قەهـر گرتـوومی هەر دەبی بـی. مـام بـاپیر ووتی: دەسـتی تـۆم شـکاوە لە ئاسـت تـۆ، فەرمـوو بیبەن. علی ووتـی: فەرمـووت خـۆش بـی. بەو شـەوەی ئەسـتیان گواسـتۆ بەبێ دەنگی. علی لە پێشـدا دەڕۆیـی و فانۆسـەکی هەرگرتبـوو بەرەو مـارێ، ئەوەی کەس چـاوەڕێی نەئەکـرد ئەو ڕووداوە کـت و پـڕە بـوو، ئەسـتی و مووسـا بـوونە بـووک و زاوا. بەیـانی بـووکی یەک شـەوە دەگەر داک و خوشـکی موسـای چـوونە کـانی ژنـان، ژن هەمـوو حەپەسـان، ئەسـتی دەگەر داک و خوشـکی موسـای، مـاری ئەسـتی لەو سـەری و مـاری موسـای لەو سـەری، لە خوشـکی موسـایان پرسـی: چبـووە؟ ئەسـتی دەگەرەنگۆ دایە. ووتی: لـۆ نەتانزانییە؟ ووتیـان : نـاوەڵڵا، لـۆ مـا چ بـووە؟ خوشـکی موسـای وەگـۆتێ: وەڵا دوونـێ شـەوێ ئەسـتیمان لـۆ موسـای بـرام داخـوازی کـردو مارەمان کـرد و گواسـتمانەوەش. کچەکان هەمـوو ناخەکیـان هەڵکێشـا ووتیـان: خـۆزگە مووسـایەکیش لـۆمە هەرەکەت. مووسا گوڵزاریشی تەڵاق نەدا، پاش چار پێنج ساران ئەویشی گواستۆ...

## مام مەعروف و پیرەژنی ژاژی فرۆش...

مەعروف پیاوەکی خواناس و لەخوا ترس بوو، ڕۆژەکی لەناو ڕەزی خۆی خەریکی ڕەز خاوینکردنەوەی بوو، لە دووری ئاوایی، هێوارە داهات و وەڕێ کەت لۆ ماڕێ، لە ڕێێ گەشتە پیرەژنەکی ژاژی فرۆش پێی ووت: پورێ، بڕۆ بچینە ماڕێ مە، ڕێت زۆری دوورە شەوت لێ دادێ ناگەیۆ جێ. پیرەژنی ژاژیفرۆش وەگەری کەت لۆ ماڕێ، شەو بە قسەی خۆش و خواردنی گویز و مێوژیان بردەسەر هەتا وەختی نووستێ داهات، ژنی مەعروفی ناوی ڕێحان بوو، جێی پیرەژنی ژاژی فرۆشی لەکنە خۆی ڕاهێخست و نووستن، چراشیان کووژاندۆ. شەو مەعرووف شەهوەتی هەستا، بە حسابی خۆی دەچوە کن ژنی خۆی، دەستیەگێڕا، پوختە پیرەژنی ژاژیفرۆشی کەتە دەست، ژاژی فرۆشیش زۆری حەز لێبوو لۆ ئیشەکی ئیوهە، گرێی لە خۆ بڕین و خۆی نەرم و شل کرد، مەعروفیش تێ نەفکری داخوە ڕێحانە یان نا، ئیشی خۆی دەگەر کرد. سبەیێ پیرەژنی ژاژی فرۆش بە پەلە پەل نانی خوارد و لە شەرمان چاشی نەخواردۆ و ڕۆیشت، مەعرووفیش نەیەزانی مەسەلە چییە لۆ شەرمێکا، بە ڕەیحانی خێزانی خۆی گۆت: بە ئازایی ئاوم لۆ گەرم کە با خۆ بشۆم و بچمە ناو ڕەزی. ڕەیحان ووتی: لۆ خۆتە شۆی، ئەدی دونێشت خۆ نەشوشت؟! مەعرووف ووتی: ئەدی شەوێ نەهاتمە کنت؟ ووتی: سەیرەبێت چووبیە کن پیرەژنی ژاژیفرۆش!. مەعرووف ووتی: برێم چ؟ خۆ بۆنی ژاژیشی لێدات. ڕێحان ووتی: مەعروف کوو ئەو ئیشەت کردیە؟ مەعرووف ووتی: خەتای من چییە، بەخۆی خۆی نەرم و شل کرد، زۆریش تاریک بوو وەمزانی ئەتووی. بەرا تازە ئەوی چوو چوو، ئیدی لە دوو چوان مەچوو، ئێستا ئەچم گەردەنی پێ ئازاکەم.

بەدوایدا ڕۆیشت و پیرەژنی ژاژی فرۆش لە مارەکی بارگەی خستبوو، وەکی چاوی وە مەعرووفی کەت بارگەی پێچاوەو هەرات. مەعرووفیش وەدووی کەت، لە جێیەکی چۆل گرتی و پێی ووت: شەوێدی هیچم دەگەرەتوو کردییە؟ ژاژی فرۆشیش ووتی: ئەرێوەڵڵا هەندت دەگەر کردم هەتا هەنگرت لێنام. مەعرووف ووتی: ئەستەغفیروڵڵا. هەر خوایە کە سەهوونەکات، توخوا گەردەنم ئازاکە. پیرازن ووتی: هەزار جارت گەردن ئازابی.

**** **** ****

## ڕاوە زوشك...

مامۆستا فەرهاد مامۆستای دێیەک بوو لە ساڵانی حەفتاکان، قوتابییەکانی لە تەمەنی خۆی بوون، بە گەورەیی خوێندنگایان بۆ کرابۆوە و چووبوونە بەر خوێندن. مامۆستا خەڵکی شار بوو، لە سوعبەت و گاڵەتە و گەپی خەڵکی لادێ شارەزا نەبوو، خوێندکارەکانیشی زۆر ساختەچی بوو ئەو کات وا باو بوو کەسێک ئەگەر غەریب بوایە یان لە شار هاتبایە لادێ زوشکیان پێ دەگرتن. بە شەو دەیانبردە ڕاوە زوشکی هەموو پێ ڕابواردنەکەش بۆ ئەو کەسە بوو کە تەنەکەی دەکوتا. ئەم گەمەیە ئێستاش لە هەندێک دێ دا ماوە. مامۆستا و سێ چوار قوتابی شەوێک لە ماڵێکدا دادەنیشن و قسەی خۆش و بە پێکەنین دەکەن. قوتابییەکان دەڵێن: با بچینە ڕاوە زوشک مامۆستاش لەگەڵ خۆمان دەبەین. مامۆستای غەریبیش

نـازانێ داوەکە بـۆ ئەوە مەمنـونیش ئەبێ لەگەڵ خـۆی بەرن. سـێ چـار گــووش و تەنەکەیەک و دوو کــوتەکە دار دەبەن و دەچـــنە دەرەوەی گونـدی. دەگەنە گـوڕڕایەکی و دەڵـێن: مامۆسـتا لێرە دانیشــە بەم دوو کـوتەکە دارە بە هەمـوو کەیفی خـۆت تەنەکە بکوتە، تـۆ غاردانـت پێ ناکرێ وە دوای زوشـکان بکەوی، ئێمەش لەم کەندڕانەدا خۆمـان مـات دەکەین و کە زوشکەکان گوێیان لە ڕمبە ڕمبی تەنەکە کووتانی دەبی لە کونەکانیــان دەر دەپەڕن و ئــێمەش دەیــانگرین و دەیــانکەینە نــاو گوشــەکان . کە پـڕ بـوون دێینـەوە لات ئەوجـا بەیەکەوە دەگەڕێینـەوە ئـاوایی، بەڵام تــا ئــێمە نێیــنەوە لات واز لە تەنەکە کوتــان نەهێنـی. مامۆسـتا بە خـۆ بە کـووتەکە دارەکان دەسـت بە تەنەکە کوتـان دەکا. قوتابییەکانیش لە مامۆسـتا ئـاودیو دەبـن و هێـدی هێـدی دەچـنەوە ئاوایی و ماڵەکانیان. ڕمبەی تەنەکە کووتان دەگەیشتە ئاوایی. مامۆستا ددانـی دەسـوین وای دەزانـی قـوتابییەکانی زوشـکی بـۆ دەگـرن مـانگە شــەوێکی ڕوونـاکە و خۆشـە، مامۆسـتا تەنەکەی خـڕ کـردەوە سـەریەک ئەوەنـدەی بە کـوتەک لێی بـدات. هەنـدێ جـار لە خەو ڕادەمـاو بـالادا ڕادەقەنـا دیسـان هەڵدەسـتاوە و دەسـتی دەکـردەوە بە تەنەکە کووتـان. چـاوەڕێیە هەتـاکو قـوتابییەکانی دێـنەوەو فەردە زوشـکەکان هەڵگـرن و بـڕۆنەوە، خوێنــدکارەکانیش لە مـاڵەوە پـرخەی خەویـان بـوو تاریـک و ڕوونـی بەیـانییە خەریـکە ڕۆژ دابـێ مامۆسـتا دەورەی خــۆی دەنــۆڕی زووشـکی چی و قـوتابی چی کوتەک و تەنەکەشی هەر بەدەستەوەیە لە کاری خـۆی نەوەسـتاوە. دەڵێـت: هەتـاکو ڕۆژ دانەهـاتووە وە باشـە خـۆم بگەینمە ماڵ، خۆ قوتابیەکانم گوڵاویان لەسـەر ناوم....

**** **** ****

**عاشقی مروەت...**

مـروەت ووتـی: ئەوکـاتە گەنـج بـووم، مـارێکی ڕەش بـوو بە عاشـق و شـەیدام! لە وەرزی هاوینـدا کاتێ کە دەچـووینە سـەر چۆخین بۆ گێرە کردنـی گەنـم و جـۆ. لەگەڵ براکانمـدا دەچـووم مـن سـواری هێسـتر دەبووم، هەموو ڕۆژێک لە ڕێگادا مارێکی ڕەش لە دوای مندا دەڕۆیشت، هەنـدێک جـار لە تەنیشـتەکانم، هەنـدێک جـار لە پێشـم، هەنـدێک جاریش دەهاتە سەر پشتی هێسترەکە سەری لەسەر شانی مندا دادەنا و لە دەورم سـەمای دەکـرد. هەر دەتگۆت کوڕە، چـوار دەورم دەدات و منیش بە هەموو کەیفی خۆ دەترسام و دەمجریکاند، مارەکەم زۆر بە ئاشکرا دەبینی، بەڵام ئەوانەی لەگەڵمدا بوون دەیان ووت: ماری چی و حاڵی چی، ئەی ئێمە بۆ هیچ مارێك نـابینین؟ دەم ووت: چـۆن نـایبینن ئەوەتە بە ئاشکر سـەما دەکات. بەڵام ئەوان هیچیان نەدەبینی منیش بە ناچاری ئەو ڕێگایەم تەرک کـرد. لەو کاتەی ئەو ڕێگایەم تەرک کـرد هیچی تر ئەم مارەم نەبینییەوە.

**** **** ****

## بێوێژدانی هەرسێک...

ڕۆژێک شوان بووم بۆ بزن لەوەڕاندن چوومە شاخی ماکۆک، ئەو کاتی گورگ و هەرس وبزنەکێوی و بەراز گەلێک زۆر بوو، جار وابوو بزنەکێوی لەگەڵ بزنەکانی خۆمان تێکەڵ و دەبوو. هەرسێکم بینی کەدە دارێکی دوولکی لە تەڕاشێک شکاندەوەو پەلەکانی لێکردەوەو بە دارێکی بەرزی هەڵنا. جارێک بە دارە دوولکە هەڵپەسێراوەکەی دا چووەسەر دارەکەو هاتەخوار و ڕۆیشت. منیش (ڕسول) لە پەنایەکدا دانیشتبووم و سەرنجم دابۆیێ، لە بەر غووردابی دارستانەکە نەمزانی ئەم هەرسە بۆ کوێ ڕۆی. پاش کەمێک بینیم هەرسەکە کودەڵە بەرازێکی لەسەر شان بوو بۆ لای دارە دوولکە هەڵپەسێراوەکەی غاری دەدا. ئێکانە و بەرازێکیشی لە دوا بوون. هەرسەکە گەیشتە لای دارەکە و بەسەر دوولکە دارەکەی کەوت، ئێکانەو بەرازەکەش زۆر خۆیان ماندوو کرد نەوێران بەسەر بکەون بەناچاری لە دەوری دارەکەی ئەسووڕانەوە و مرە مریان ئەکرد لە خەمی کودەڵەی بەچکەیان. هەر ئەوەندەم بینی هەرسەکە کودەڵەی بڵند کرد و فرێیدا، ئەوەندە بە زەبر بە بەردەکی دادا لە بن دارەکە بووە و گیانی لەبەر دەرچوو. ئێکانە و بەراز وەکو مرۆڤان بۆ بەچکەکەیان دەگریان. کاتێ کە بێ ئەمەل بوون ڕۆیشتنەوە و هەرسیش هاتە خوارێ و ئەو جارەش بزر بوو. بەینێکی پێچوو وەکو جارەکەی پێش و کودەڵەیەکی لە سەر شان بوو و غاری دەدا، ئێکانەو بەرازێکیشی بە دوا کەوتبوون، بەڵام نەیدەگەشتێ، کوژەڵەکەش هەر دەیچریکاند، وەک جارەکەی دی هەرس بەسەر دوولکە دارەکەی کەوت و چووە سەر دار بەڕوەکە، بەراز و ئێکانەش هەر مرە مرو پێڕنەیان ئەکرد. هەندێ جار دەنوزانەوە و بەبەر

هەرسـەکەیان دەنـۆڕی وەکـو ئەوەی بپـارێنەوە، کـودەڵەکەش هەر دەیچریکانـد. ئەو جـارەش هەرسـی بێـوبژدان کـودەڵەی فڕێـدا و بە بەردێکـی دادا و لەت و پەت بـوو. ئێکـانەو بەراز چـوونە سـەر تەرمـی کودەڵەکەیـان و ئەوەنـدەیان خـۆ لە خـۆڵ وەردا شـەیتان زگـی پـێ ئەسـووتان. ئەو جـارەش بەراز و ئێکـانە بە نائومێـدی چـوونەوە و هەرسیشیان بە دوا کەوت. منیش بێوبژدانی هەرسەکە کاری تێکردم و ووتم: شـەرت بێ چارەت کەم هەی بێوبژدان. چووم دوولکە دارەکەم لە دار بەڕوەکە کـردەوە و لە شـوێنێکی دوور فڕێمـدا و خـۆم لە شـوێنی خـۆم مـات کـردەوە و چـاوەڕێم کـرد. هەرسـەکە دیسـان کـودەڵەیەکی لەسـەر شـان بـوو و غـاری دەدا و ئێکـانە و بەرازی بە دوا بـوون نەیدەگەیشـتنێ، هەرسـەکە گەیشـتە لای دارەکە و دوولـکە دارەکە نەمابوو دوو جار بە دەوری دارەکە سووڕایەوە، بەڵام بێ سـوود بـوو، ئێکانە خۆی گەیاندێ و شـرفەیەکی زۆر بە تونـدی لێدا و ئەوەی لە زگی دابـوو لە پاشـەڕێیدا هـاتە دەرێ، هەنـدی شـرفە لێـدان هەتـاکو کـوڵی خۆی لێ ڕێشت و تۆپاندی...

**** **** ****

## خەلیفە لە ترسی خۆی ناوێری لەسەر دەروێش هەستێ...

دوو کووڕی گەنجی هاوتەمەن هەبوون، یەک ناوی دەروێش بوو ئەوی تریش ناوی خەلیفە بوو. دەروێش کوڕێکی زۆر حەسەبی بوو کەس نەدەوێرا بیدوێنێ. خەلیفەش کوڕێکی زۆر هێمن و لاشەڕ بوو. ڕۆژێک دەروێش و خەلیفە بە تەنیشت یەک دادەڕۆن و دەروێش شەڕ بە خەلیفەی دەفرۆشێ، لە ناکاو دەروێش وەبن دەکەوێ و کەمی لێنابێ بەر ڕەوانیان بکات. دەروێش لە بندا هاوار دەکا و دەنەڕێنێ و دەڵێ: خەلیفە هەستە لەسەرم، ئەگەرنا هەڵدەستمەوەو دەتخنکێنم! خەلیفە لە ترسان نەدەوێرا هەڵسێ، نەوەک هەڵسێ و بیخنکێنێ، بە هەردوو دەستان توووند دەروێشی گرتبوو و چاوەڕێی یەکەکییە کرد بێ و لێکیان بکاتەوە. خەلیفە دەستی شل بوون و توانای نەما و کەسیش نەهات بە ناچاری دەستی لە ملی دەروێش کردنەوەو بە تەڕدەستی هەڵات، دەروێش بەدوا کەوت، بەڵام پێینەگەیشت هەتا خەلیفە چووە بنەبانی خانووی. دەروێش ووتی: خەلیفە ئەوە ئەچم سێ شەو و ڕۆژان تەورداس و بێوران دەسووم، دواتر لەگەڵ خۆمیان هەڵدەگرم و دەگێڕم، لە هەر شوێنێک بتبینم هورد و هەڕات دەکەم! سێ شەو و ڕۆژان تەورداس و بێوری سووین، هەندەی تیژ کردبوون لە ملی گاجووت نابا دەیپەڕاند! خەلیفەش لە ترسی دەروێشی نەدەوەێرا لە بنەبانی خانی بێتە دەرێ، چونکە دەیزانی گەر لە هەرشوێنێ بیگاتێ خراپی بەسەر دێنێ. خەلیفە برایەکی هەبوو ناوی رسول بوو، بە خەلیفەی گووت: ئەوە لۆ لە بنەبانی خانووی نایێیتەدەرێ؟! ئیشەکی ناکەی؟ ئەویش ووتی: وەڵڵا برام چت لێبشارمەوە ئەوە لە ترسی

دەروێشی، لە هەر شوێنەکی بمگاتێ بە بیور و توورداسان لەت و پەتم دەکا، لۆیە ناوێرم لە مارێ بچمە دەرێ...

**** **** ****

بووک بۆ ڕەوەندی شوان:

ڕەوەند کوڕێکی تازە پێگەیشتوو بوو، لە منداڵیەوە ژیانی بە شوانی ئەگوزەراند. ماوەیەک بوو داوای ژنی ئەکرد. ڕۆژێک ووتی: باوکە ئەگەر ژنم بۆ نەهێنی چیتر شوانی ناکەم و ناچمە کن بزنان. باوکی ووتی: ئەوڕۆش بڕۆ، ئەگەر تا ئێوارە هاتیەوە بووک ئامادە نەبوو ڕازی مەبە. هەر گەیشتیەوە ماڵ، گۆچانەکەت دانێ و دۆخینت بکەرەوە. ڕەوەندیش وەک ڕۆژان چووە کن بزنان بە هیوای ئەوەی ئێوارە ببێ بە زاوا. باوکی ڕەوەند ووتی: خۆ ڕەوەند مێشکی کلۆراندوومە و پارەشم نییە ژنی بۆ بێنم، تەگبیرێکی لێ بکەم باشە. ئێوارە پێش ئەوەی ڕەوەند بگەڕێتەوە باوکی ڕەوەند مەشکەیەکی فودراوی هێنا و لە بنەبانی خانووی لەسەر لبادێک درێژی کرد و لێفەیەکی پێدادا. ژوورەکە ئەوەندە تاریک بوو چاو چاوی نەئەبینی. ڕەوەندی شوان لەلای بزنەکانی گەڕایەوە و ووتی: باوکە بووکت بۆ هێناوم؟ باوکی ووتی: بەڵێ کوڕم خێرا بە بووک لە ژوورێ لە ژێر لێفی چاوەڕێت دەکا. ڕەوەند ئەوەندە تامەزرۆ بوو بە خێرایی گۆچانەکەی فڕێداو تێ نەفکری چی لە بن لێفییە هەر لێفی لەسەر لابرد و خۆی هەڵدا سەر و زەوقی خۆی لێ ڕشت، دواتر کە زانی ئەوە بووک نییە و مەشکەیە! هەر بە توندی مەشکەی بە دیواری دادا و ووتی: بەخوا ڕۆژێکی دی شوانی ناکەم...

**** **** ****

### وەکو سۆفی خۆی دەرئەخا:

پیاوێکی قسەخۆش و قسەزان بە ناوی محمد ووتی: لە ساڵانی ١٩٦٠ لەبەر جۆگەیەک پارچە گەنمێکم کردبوو، لە تەنیشت گەنمەکەی منیش پارچە تەماتەیەک کرابوو. گەنمەکەم دووریەوە و گێرەم کرد و خەریکی شەنەکردنی بووم و ووتم: بۆ خۆم نەکەم بە سۆفی و خۆم بە پیاوێکی نوورانی نیشان نەدەم؟ جا ڕیشێکی گەورەم دانا وتەسبیحێکی قەزوانم لە دەست گرت و دایم سوبحانەڵام دەکرد، هەر کەسێ بەلامدا تێپەڕیبا دەیوت: مام سۆفی ماندوو نەبی، منیش دەمووت: یاخوا بەخێر بێی وەبەر ڕحمەتی خوای کەوی. خاوەنی پارچە تەماتەکەی تەنیشتم هەند ڕەزیل بوو، ڕۆژێک نەیووت: مام سۆفی ها ئەو دوو تەماتەو باینجانەی لۆخۆت ببە. منیش هەر کە شەو دادەهات دەچوومە ناو پارچە تەماتەکەی پێتەرازووێکی پڕم تەماتەو باینجان لێدەکردەوە. کە ڕۆژیش دادەهات خۆم دەکردەوە سۆفیەکەی جاران، کە کەسێک بەلامدا دەهات دەستم بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە و لەبەر خوا دەپاڕامەوە، دەیانووت: بەخوا مام سۆفییەکی بە دینە کەشف و کەڕامەتی هەنە و یادی خوای دەکا، ڕۆژێک خەریکی شەنەکردن بووم کزەبایەکی نەرمی دەهات، لە ناکاو گاجووتێکی زەردی قۆچ قیتی کلک درێژ بەلامدا تێپەڕی و چووە دەم ڕووباری. نیو کاتژمێری پێچوو پیاوێکی پیر بە مشاوەشی بۆ لای من دەهات، منیش ووتم: خوا ناردی، هەڵسام دەستم کرد بە تەسبیحات و بە پارچە دارێک دنکە گەنمم لە درزەکانی دەوروبەری جۆخینێ هەڵدەگرتنەوە. کاتێک کە پیاوەکە بینیمی ووتی: بەخوا مام سۆفیەکی بە دینە. ووتی: خەرمان بەرەکەت مام سۆفی منیش ووتم: بەرەکەتی خوات بەسەردا بڕژێ،

یـاخوا بەخێربێی. ووتـی: گـاجووتێکم لێ وون بـووە، لە خـاوەن پـارچە تەمـاتەکەی تەنیشـتتم پرسـی وتـی: مـام سـۆفیەک هەیە کەشـف و کەرامەتی هەنە، ئەوجـا خـوا خێرت بنووسێ گاجووتەکەم بـۆ بـدۆزەوە. منیش دەستم بۆ ئاسمان بەرزکردن و چاوەکانم داخستن و پاشـان بە پیـاوەکەم ووت: بـڕۆ سـەر ڕووبـارەکە گـاجووتەکەت لەوێـیە. ئەویـش چـوو و بە گـاجووتەکەیەوە گەڕایەوە، دەسـتی مـاچ کـردم و ووتـی: بە قوربانی ئەو ڕدێنەت بم مام سۆفی بەخـوا غەیب زانی، ئەم گاجووتەم لەمەڕ تـۆ ئەزانـم، جـا بەیـانیش دیـاریەکی باشـت بـۆ دێـنم. ووتـم: ئەسـتەغفیرولا، مـن ئەو کـارەم لە پێنـاو خـوا کـرد، هـیچ پێویسـت بە دیاری ناکات. ووتی: بەخوا شتی وا لە گۆڕێ نییە هەر ئەبێ پاداشتی ئەو کارەت بـدەمەوە. منـیش منەتم نەبرد بـۆ شـتێکی ئـاوا، کابرا ڕۆیشـت و بەیـانی لەگەڵ خـۆرهەڵات بینـیم کـابرا کەرێکـی بە پـێش خـۆی داوە و تێرێکی پڕ لە شمەکی لێ بار کردووە، کە گەیشـتە لەم تێرەکەی دابەزاند، قنەقنی لەبنەوە دەهـات تـا دایبەزاند ئەوەنـدە قـورس بـوو، منیش ووتم: بەخـوا پێویسـتی بەم ئەزیەتە نەدەکـرد، خـۆ من لە ڕاهی خـوا ئەم کارەم کـرد. تێرەکەی کـردەوە پەنیر و دۆ و گۆشـتی مەڕی تێـدا بـوو! کابرا ووتی: ئێسـتا دەڕۆم کـارم هەیە، بەڵام دەبـێ نیوەڕۆخوانێـك لە مـاڵی مـن نـان بخۆی، مـاڵم لەو گونـدی بەرامبەرمـانە. منیش ووتم: بەخـوا پێویسـت ناکا خۆ من کارێکی وام نەکردووە بۆ ئەم هەموو ئەزیەتە بدەمە بەر تۆ. ناوەناوەش دەموت: سبحان اللە لا الە الا اللە. پاش مشـت و مڕێکی زۆر ڕازی بووم کە بچمە ماڵی، پێم ووت: هەتاکو ئەم خەرمانە کا و دانەکەی لێـک جیـانەکەمەوە و نەیـبەمەوە مـاڵ و دای نەکەم پـێم نـاکرێ، کە فێنـک داهـات دەور و بەری وەرزی پـایز سـەردانێکت دەکەم. ئەویـش ووتـی: زۆر باشـە چاوەڕێـت دەکەم، بەڵام توخـوا نزامـان بـۆ بـکە نـزای

چاک. جا ماوەیەک بوو پارووم چەور بوو، بۆ ماوەی حەفتەیەک پەنیر و گۆشت و دۆم لە بڕان بوو. جۆخینەکەم گێرەکرد و خەرمانەکەم داکرد. کە فێنک داهات ڕۆژێک خۆم کردەوە مام سۆفیەکەی جاران و بەڕێ کەوتم بۆ ماڵی کابرا. کابرا هەر لە دووڕا منی بینی هات بە پیرمەوە و ووتی: مام سۆفی ئەوە هاتی؟، بەخوا دەمزانی کە دێیت و لەسەر بەڵێنەکەی خۆت دەبیت، بەردەوام چاوێکم هەر لەسەر ڕێگا بوو. گەیشتە لام و شانی ماچکردم. پیاوەکە عەلەشیشێکی کوشتەوە و وە ژنەکەی دا و پاشان لە ژوورەوە قسەی خۆشمان کرد، نوێژی نیوەڕۆشمان بە کۆمەڵ کرد و نیوەڕۆ خواردنێکی بەتامان خوارد، سەماوەریش گزەی دەهات چا لە دوای چا بۆیان تێدەکردم، هەتا ئێوارەش خۆشمان ڕابوارد و دواتر گەڕامەوە گوند و ماڵەوەمان...

## گاڵتەو سوعبەتی جاران:

مروەت و سلێمان تازە بووک و زاوای یەک شەوە بوون. بەیانییەکەی مروەت لە پێش دەرگا گسکی لێدەدا و لەو کاتەدا پیاوێک بەلایدا تێپەڕی و پێی ووت: بە سلێمان بڵێ: با بێتە دەرێ و یەکم بداتێ، بە خێرایی پێی بڵێ، دەنا دەڕۆم کارم هەیە و زۆر بە پەلەمە! مروەت لەبەر خۆیدا ووتی: ئەیەڕۆ تووڵێی مێردۆکەی (...) بێ؟! لە سلێمان کەوتە گومان و خەمبار بوو، کە چووە ژورێ لەڕوی نەهات پێی بڵێ: پیاوێک لە دەرەوە چاوەڕێت دەکات و ئەوەهای پێ گوتم، دواتر چووە دەرێ کابرا لەوێ نەمابوو، ماوەیەك مروەت زۆر غەمبار بوو. ڕۆژێك سلێمان پێی ووت: ئەوە چ؟ ڕوویداوە بۆ وا خەمباری. ئەویش ووتی: پیاوەکە چیت لێ بشارمەوە، پیاوێک قسەیەکی ئەوەهای کرد! سلێمان دایە قاقای پێکەنین و ووتی: باوەڕ نەکەی، ئەوە خدری هاوڕێم بووە و زۆر

گاڵتەچییە، ویستوویەتی بزانێ تا چەند باوەڕ دەکەیت و من و تۆ شەڕێك بکەین و ئەوجا پێمان پێ بکەنێ...

**** **** ****

**پیرەژنە دۆم، پزیشکی ژنی نەزۆک:**

پیرەژنەدۆم بە گوندانـدا دەگەڕان، لەم دێ بۆ ئەو دێ، تەشی و تیرۆکیان لەسەر سکی ژنی نەزۆک بادەدا، بەو مەبەستەی منالیان بێ. لە بەرامبەر ئەو کارەیان پەنیر و کەشکو گەنم و خوری و پێستی ئاژەڵیان وەردەگرت. جا ئەگەر ئەو ژنانەی کە پیرەژن تەشی و تیرۆکیان لەسەر سکی بادەدان منداڵیان بووبایە، دەیان ووت: یا پیرەژنێ نەبایە، بەتەمای کەچەمێردی قەت منداری نەدەبوو. پیرەژنە دۆمێک فێربووبوو هەموو مانگێک دەچوو بۆ دێیەک و تەشی و تیرۆکی لەسەر زگی ژنان بادەدا. گەر ژنێک منداڵی نەبووایە، چاوەڕێی پیرەژنێی دەکرد، هەتاکو دەهات و تیرۆکی لە سەر زگی بادەدا. وسووە ڕووت، پیاوێکی کامڵ بوو، ژنێکی هەبوو ناوی شەم بوو، ڕۆژێك پێی ووت: شەمێ ئەوە پیرەژنەدۆم هاتەوە، ئەمنیش ئەچمە بنەبانێ ژۆرا پشتەوە لەوێ خۆم مات دەکەم و دەچمە ژێر لێفەیەک، بە پیرەژنەدۆمێ بڵێ: بووکێکمان هەیە منداری نابن، وەرە تەشی و تیرۆکانی لەسەر زگی بادە. ئەوجا شەم چووە پێشوازی پیرەژنێ و زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی لێ کرد و پێی ووت: فەرموو با بچینە ژوورێ بووکێکم هەیە منداری نابن، تیرۆکێی لە سەر زگی بادە، ئەوجا پیرەژنی بردە ژۆرێ، هەند تاریک بوو چاو چاوی نەدەدیت، جا پییرەژن گۆتی: ئەوە کوا بووکە خان؟ وسووە ڕووت، بە

دەنگی ژنـان گـۆتی: ئەوەتـا لێرەم. پیرەژنێ وەگـۆ: چـرا ڕەشـکەیەکم بـۆ پێکەن زۆر تـاریکە، شـەمێ وەگۆ: بە ناشـوکری نەبێ چرامـان نییە. جـا پیرەژن بە دەسـتکوتانێ لە وسـووە ڕوتـی وە نزیـك کەوت، ئەویـش زگی خۆی هەرکرد و پیرەژن دوو سێ جار تیرۆکی لەسـەر هیناو برد و وەیگۆ: منـدارەکی حەوت مـانگی دەزگی دایە! وسـووە ڕووت خـۆی پێ نەگیراو دەسـتی پیرەژنێـی گـرت و لە سـەر هەرامەی خۆیـدانا و پیرەژنـێ لە چریکژنـدا و ویسـتی دەربەڕێ، بەرام هەنـد تاریـك بـوو زارکی نەدیـتەوە، وسـوە ڕوت لینگەکی گـرت و خـۆی هەردا سـەرێ، زۆری نەبـرد پیرەژن لەسـەر چەنگـان هـاتەدەرێ و تیرۆکیشـی لـێ بەجێمـا و هەرات، چ هەراتنەك جارەکی دی بەلای ئەوی گوندەیدا نەهاتەوە...

### ئۆمەر خۆی سوننەت ئەکا:

کوڕێکی گەنج ناوی ئۆمەر بـوو تەمەنی گەیشـتبووە بیسـت و پێـنج سـاڵ هێشـتا سـوننەت نەکرابـوو، کار و پیشـەی شـوانی بـوو. ڕۆژێـک چەنـد پزیشـکێکی سـوننەت کـردن هـات بـوونە گونـدەکەیان، جـا پزیشـکەکان هەمـوو جـار هـاوار دەکەن دەڵـێن: دایـک و باوکـانی خۆشەویسـت، منداڵەکانتان بێنن با سـوننەتیان بکەین. ئۆمەر لە شـاخ بوو گوێی لێبوو ووتـی: ئەوە مـن خـۆ بەتەمـام ژن بێـنم، واباشـە بچـم خـۆم سـونننەت بکەم. بزنەکانی بە جێ هێشـت و هاتەوە ناو دێ ، پزیشکەکانی بینی، جا ئەوکات بە پزیشـکی سـوننەت کردنیـان دەوت (عەلەن نەبی)، شـەرمی کـرد بچیـتە کنیـان و پێیـان بڵێ منـیش سـوننەت بـکەن. زیـڕ و هـۆڕی منـاڵان دێـیەکەی پڕکردبـوو، ئـۆمەر سـەیری قیـافەی خـۆی کـرد و پێکەنینی بە خۆی هـات. کە پزیشـکەکان منداڵەکانیـان سـوننەت کـردن،

ئەوجا بەرێ کەوتن بۆ دێیەکی تر، ئۆمەریش بە دوایان کەوت، کە لە دێیەکە دوورکەوتنەوە، ئۆمەر بانگی کردنێ و ووتی: هۆی عەلەننەبییەکان بوەستن. ئەوانیش کە گوێیان لێبوو ڕاوەستان و پێیانووت: منالّت ماوە سوننەتی بکەین؟ ئۆمەر ووتی: ناوەڵڵآ. ئەی برای بچووکت ماوە؟ ناوەڵا، ئەی کێ؟ بۆخۆم ماوم سوننەتم بکەن، شەرمم کرد لە ناو دێدا پێتان بڵێم سوننەتم بکەن. وە بەنیازیشم ژن بێنم، پزیشکەکان دایانە قاقای پێکەنین و وتیان: خۆ لەمە گەورەتر نابی، بۆ تا ئێستا سوننەت نەکراوی. ووتی: ئاخر تا ئێستا کارم شوانی بووە زۆر لە ناو ئاوەدانی نەژیاوم. ووتیان: دەباشە خۆت بخەرە سەر پشت. ئۆمەر پالّی دایەوەو شەروالّیان داکەند و پێی گووتن: بە تەڕدەستی کارەکە بکەن تا کەس نەهاتووە. جا سوننەتیان کرد و ئۆمەر گەڕایەوە گوندەکە و سێ ڕۆژ لە مالّەوە لەسەر پشت ڕاکشا، لێیان پرسی ئەوە بۆ کەوتوی؟ کوێت دێشی، جارێك دەیگووت: زگم دێشێ، جارێك دەیگووت: سنگم دێشێ، بەو شێوەیە دوای سێ ڕۆژ هەلّسایەوە و مالّەوەشیان نەیانزانی کە سونەت کراوە...

****　　****　　****

## میوانێکی بە ڕوالّەت کوێخا

بارام ووتی: منالّ بووم مالّمان لە گوندێک بوو ڕۆژێک لە مالّەوە دانیشتبووم دایکم لەبەر دەرگا گسکی لێدەدا ووتی: کوڕم سمکۆی خالّتان هات بە پیریەوە هەڕوون. من و برایەکم بە ناوی ڕەسوو بە پیریەوە چووین، بەلّام خالّ چ خالّ، هەر دەتگووت کوێخا بوو، بە

سواری جوانە ماینێکی ڕەشی نێو چاوان قەڵەبەش. ڕانک و چۆغەڵێک بوزوی زەردی پۆشتەی لەبەردا بوو، جامانیەکی کشت و قیت و نوێی لەسەر نابوو دەسڕۆکێکی جوان و نوێی لەبەر پشدێندانابوو و پشدێنێکی قاف قافی لە ناو قەدی بەستبوو. هێندە پۆشتە بوو کچی چواردە ساڵ بینیبای دڵی بۆی دەچوو. من و ڕەسووی برام قەڕاسەی جوانە ماینەکەمان گرت و خاڵم دابەزی و ئەولاو ئەولای یەکترمان ماچ کرد و چووینە ژووریّ و دانیشتین. کات کۆتایی پایز بوو. سمکۆی خاڵم هەڵکشا سەری ژووریّ و قاچی خستە سەر قاچی و شای بە سەپان نازانی. دایکمان لە خۆشیان شاگەشکەبووبوو سمکۆی برای هاتۆتە لای، ناحەق نەبوو ساڵی جارێک دەهاتەماڵمان. ئێوارە زیافەتێکی باشمان بۆ کرد، خاڵم ئەوەندە حەزی لە گۆشت بوو تا زگی هێشا گۆشت و چەوری خوارد. ئەو شەوەمان بە قسەی خۆش و نەستەق بەسەربرد، خانووەکەشمان تەنها ژوورێکی دانیشتن و ژوورێکی تری بچووک کە نان و شیومان تێدا حازر دەکرد، پێنج شەش ئەستوندەی تیادا بوو هەموومان لە ژووری دانیشتن نووستین، نیوەی شەو سمکۆی خاڵم تووشی زگچوون بووبوو، بێجامەکەی پڕکردبوو. کاتێ کە هەستی پێ کردبوو بێجامەکەی لە پێی کردبوو و شەرواڵی باوکمانی دەبەر کرد و بێجامەکەی لەبن لێچکە بەرێک دانابوو و بە بێ دەنگی بە بێ ئەوەی کەسمان لە خەو هەڵسێنێ دەرگاکەی کردبووەوە و سواری ماینەکەی بوو بوو و بەرە و ماڵ بەڕێ کەوتبوو. بەیانی دایکم وە خەبەر هاتبوو و بۆنی گووی کردبوو، بە هێواشی بانگی کردم ووتی: بارام هەستە، ئەوە گووت دەبنە خۆت کردووە؟ عەیب ناکەیت! منیش دەستێکم دا قوونی خۆم و ووتم: من گووم دەبنەخۆم نەکردووە. باوکیشم هەڵسا و ئەویش بە دوای بۆنەکە دەگەڕا هەموومان بە

هێواشی قسەمان دەکرد، ئەوەک سمکۆی خاڵم لە خەو هەستێ، وامان دەزانی هێشتا هەڵنەستاوە، چونکە ژوورەکە تاریک بوو. ڕەسوی براشم لە قورنیچکێکی ژوورەکەدا نووستبوو، بە هەمووان هەڵمان کوتایە سەری و لێفەکەمان لەسەر لابرد و هاواری کرد، پێمان ووت: وسبە با خاڵمان هەڵنەستێ، ئەوە بۆ گووت دەبنە خۆت کردووە؟! ئەویش دەستی کردە قوونی خۆی و ووتی: وەڵا من نەمکردووە. پاشان باوکم چوو بۆ لای جێگەی خاڵم، ئەو لە ژێر لێفەکەی نەمابوو، لێچکەبەرەیەکی هەڵدایەوە و بێجامەیەکی سپی پڕ لە گووی لە ژێر بوو و بە دەنگێکی بەرز گووتی: ژنێ چیتر لە منداڵەکان مەدە، ئەوەتا خاڵی منداڵەکان گووی دەبنە خۆی کردووە.

شێتێک بە شێتایەتی خۆی، شێتێکی تر دەباتە سەر مەرقەدی شێخ

پیاوێک لە تەمەنی پیری دا شێواو و بە تەواوەتی شێت بوو. ئەو ناوی بلە بوو پێیان ئەوت بلە شێت، زۆریان نوشتی و کشتەک بۆ کرد لە لای مەلا و شێخان، بەڵام سوودی نەبوو وای لێهات هاربووبوو، کەس نەدەوێرا لە تەنیشتی دابنیشێت. پیاوێک هەبوو ناوی سەعید بوو پێیان ئەوت سەعە لە پێشتر زۆر هاوڕێی بلە شێت بوو هەر لەسەر حیسابی سەردەمی ئاقڵی لە بلە شێت نزیک بوویەوە، نەی دەزانی مرۆڤ کە شێت بوو دۆست و دوژمن لای یاک حیسابە، ڕۆژێک سەعە لە لای بلە شێت دانیشتبوو شانی وە شانی دابوو قسەی گەورە گەورەی دەکرد، لە پڕێك بلە شێت چەپەڵۆکێکی لە سەری سەعە دا و سەعە هێڕ و هوڕ بوو. سەعە بە شەت و خواری گەڕایەوەماڵەوە و لە ماڵەوە یەک حەفتە کەوت لە ژێر لێفە خەریک بوو ئەویش شێت بێ. ڕۆژێک بلە شێتیان بردە سەر مەرقەدی شێخێك، دوو ئۆتۆمبێلی پڕ

سەرنشینی لەگەڵ چوون، پیاوێکیان لەگەڵ دابوو پێیان ئەوت ماڵە، بە هۆی ئەوەی زۆر یان بردبۆ سەر ئەو مەرقەدە ئەزموونێکی لەو بوارە هەبوو و خۆی وەگەر خستن، دەمارێکی شێتی هەر مابوو، جا کە گەیشتنە مەرقەدەکە پێش هەمووان ماڵە شێت بلە شێتی بردە ژووریێ و لەویێ بلە شێت ووتی: ماڵە شێت ئەوە تۆ شێت تری یان من؟ یەک مستی ڕاوەشاندە ماڵە و سەر و لووتی پرکردن لە خوێن، ئەوجا لە ژوورەوە دەرگاکەی شیشدا، لە دەرەوە خەڵکی تەمەشایان دەکرد، هەردووکیان ملی یەکتریان گرتبوو و ئەو دەیویست ئەو بخنکێنێ و ئەویش دەیویست ئەو بخنکێنێ، هەردووکیان دەویان کەفی دەکردبوو زۆر شەکەش بووبوون. خەڵکی چیتر خۆیان پێ نەگیراو دەرگاکەیان شکاند و چوونە ژوورەوە و عەرەقەی ڕەش و سپیان کرد تا لێکیان جیا کردنەوە. ماڵە شڕو شەپڕێو بوو بوو، دەتگووت مریشکە لە ئاوی گەرمیان هەڵێناوە و پەڕوو پاڵی پێدا شۆڕ بووبوونەوە، قاچەکانی شەت وخوار بووبوون عاردیان نەدەگرت. لەویێ شێخێکی لێبوو، بەدوایدا چوون و هێنایان و پێیان ووت دووعایەک بۆ بلە شێت بکە و دەستێکی بە سەردا بێنە، بەڵکو کەمێک بێتەوە سەر خۆی. شێخ هات و عەبایەکی شۆڕەی لە بەردا بوو شاقەڵی لە دوا دەخشان. بلە شێت کە چاوی بە شێخی کەوت هەر بە یەکجاری هار بوو خۆی ڕاپرچکاند و بەرهەر بوو و کەوتە دوای شێخی. شێخ لە پێشدا هەڵدەهات و بلە شێت بە دوایەوە ئەو خەڵکەی لەویێ بوون هەموویان بەدوایان کەوتن. بلە ئەوەندە لە شێخ نزیک کەوتەوە هەر جارەی پێیەکی لە شاقەلە عەبایەکە دەنا پارچەیەکی لێدەکردەوە ولە هیکرا عەباکەی شێخ ڕە هەوا دەکەوت. بلە شێت لە پاشڕا عەباکەی شێخی گرت و شێخ وەک مسراح سووڕایەوە سەر یەک و دم و دم وە عەرزی کەوت. هەتا

خەڵکەکە گەیشتە لایان بلە شێت پێنج شەش مستی لەسەر و گوێلاکی شێخ وەشاند و شێخ یەک بە خۆ لە هارژنی دەدا و دەیوت: ئەی هاوار فریام کەون ئەوە شێتە یان هارە هێناوتانە. شێخیان لە بەر دەستی سالە شێت دەرهێناو ووتی: هەتاکو من لە ژیاندا مابم نابێ سەیری هیچ شێتێك بکەم نەک دوعای بۆ بکەم. شێخ هەندە شڕو شەپڕێو بوو دەتگووت ماره بە ژنان کوشتیتیان، عەباکەشی زیوار زیوار بوو بوو دەتگوت کەوتۆتە بەر دەڕاسە. بلە شێتیان سواری سەیارە کرد و هێنایانەوە. ڕۆژێک بلەیان بردە لای دکتۆرێکی نەخۆشی دەرونی، ووتیان: بلە سواری سەیارە بە. ووتی: من سواری سەیارە نابم. بە چوار پێنج کەس بلەیان گرت و سواری سەیارەیان کرد و بەستیانەوە و دەرگاکەیان لەسەر داخست و گەیشتنە پیش نۆرینگەی پزیشکەکە. بلە شێتیان هێنا خوارێ و ووتیان: پێشمان کەوە، ووتی: من نەخۆش نیم ئێوە پێش کەون. لە پێش نۆرینگەکە ، زۆری بە بەردا کەوتن، بێسود بوو نەچووە ژوورێ. هەردوو دەستی بلەیان گرتن و دوو کەس ڕایان دەکێشا و سێش پاریان پێوە دەنا تاکو کردیانە ژوورەوە. پزیشکەکە بە بلەی ووت: لەسەر قەرەوێڵەکە پاڵکەوە. بلەش پێی ووت: تۆ پاڵکەوە. هەردووکیان بە بەرێك هەڵچوون، لەکۆتایدا بلەشێت پزیشکەکەی گرت و خستیە سەر قەرەوێڵەکە، بەهەموان گرتیان، ئەگەرنا خراپی پێ دەکرد...

**** **** ****

## ڕەسوە کەشخە

کوڕیکی گەنج هەبوو پیشەی شوانی بوو، ناوی ڕەسوو بوو، تاقانە بوو جا دایک و باوکی زۆر نازیان هەڵدەگرت، کارەک و ساق و گۆرەوی و قاتێکی بووزوویان بۆ کڕیبوو. ڕۆژێک باوکی پێیووت: ئەمڕۆ من لە جیاتی تۆ دەڕۆمە لای بزنەکان، تۆ بۆ خۆت بڕۆ ناو گوند بگەڕێ، کامە کچت حەز لێبوو بۆ خۆتی هەڵبژێرە تا بچم بۆتی بخوازم. جا بزنەکانی لە هۆڵێ دەرکردن و بردنی بۆ شاخ، ڕەسووش گۆرەوی و ساق و کارەکی دەپێ کردن و قاتە بووزووەکەی دەبەر کرد و هێندەی خۆ کەشخە کرد، شای بە سەپان نەدەزانی. جا ڕەسوو بە ناو ئاوایی دا گەڕا، لە ناو گوند کانییێکی لێببوو، لەسەر کانییەکەش ڕێزە دارتووێکی لێبوو، تووی جوان و تەڕ و بەلەزەتی پێوە بوون، ووتی: جا کاتی ئەوەیە بچم تو بخۆم. کە گەیشتە سەر کانی لەسەر یەکێ لە دارتووەکان خدری هاوڕێی لەسەر بوو، ئەویش هەر شوان بوو، بانگی ڕەسووی کرد ووتی: ڕەسوو وەرە تووی بەتامی پێوەنە وەرە بخۆ. ڕەسووش ووتی: خۆ منیش هەر بۆ ئەوە هاتووم. جا پێڵاوەکانی لەبەر کردن و بەسەر دارەکە کەوت، لە نێوقەدی دارەکە بوو کە خدر شەڕواڵەکەی داکەند و تەپلە گووێکی بە ڕەسوو داکردا ڕەسوو کە خۆی ئەوها بینی، هێواش هێواش لە دارەکە خزیە خوارەوە و ووتی: جا ئێستا چۆن بچمەوە خۆ کەس نامناسێتەوە، هەموو جلوبەرگم بووتە گوو، ئەوە بەتەما بووم شەو بچمە خوازبێنی خەجیلێ..

**** **** ****

## قوماندار نیسکێنە ناخوات...

لە سالآنی ۱۹۱۰ بارەگایەکی جندرمە لە گوندی بێتواتە بوو، سەرۆکی بارەگایەکە قوماندای پێ دەگوترا، هەموو ڕۆژێ داوای لە خەڵکەکە دەکرد کە بانگهێشتی نان خواردنی بکەن بۆ ماڵەکانیان. ڕۆژێک بە مام سابیر ووت: نیوەڕۆ بە خۆم و مێ چوار جندرمە میوانی تۆین. مام سابیریش ووتی: بە چاوان، هەرچی خوا دابووی بەیەکەوە دەیخۆین. قووماندار ووتی: دەبێ مامرم بۆ سەرببڕی، من بەتەنیا مامرێک دەخۆم. مام سابیر چووە ماڵەکەی و بە ژنەکەی ووت: ژنەکە چیمان هەیە؟ ئەویش ووتی: بە سەری مناڵەکان لە گۆڵە نیسکێک زیاترمان نییە. مام سابیریش ووتی: دە مادام بیکوڵێنە و بۆ قوماندای ئامادەبکە. لە کاتی نان خواردنی نیوەڕۆ قووماندار و پاسەوانەکانی هاتن و دانیشتن، مام سابیر لەگەنی پڕ لە نیسک و دوومێ نووشتیە نانی جۆی لە پێش دانان و پێی ووتن: فەرموون، ناوی خوای لێ بێنن، قوماندار کە نیسکی بینی! چاوی زەق بوون و بە تووڕەیی و بە هەردوو دەستی کۆتکە نیسکەکەی بەرزکردەوە و بە سەر و شانی مام سابیری داکرد. نیسکەکە هێندە گەرم بوو مام سابیر لە هارژنیدا و کەوتە گۆڕێ، قوماندار و جندرمەکانی بە سکی برسی بەرەو بارەگاکەیان گەڕانەوە...

****        ****        ****

**که له کاروانکردن گه‌ڕایه‌وه، پرسه‌یان هه‌ڵگرتبوو...**

پیاوێـک به نـاوی حه‌مه‌د، (مـام خه‌لـیفه) ی نازنـاو بـوو، پیـاوێکی زۆر ئارامگر و له‌سـه‌ر خۆ و دینـدار بـوو، به پیـاوێکی به کاوه خـۆ ناوبـانگی کردبـوو. جـا ســاڵێک تــووتنێکی زۆری کـڕی، له چه‌نــد وڵاغه‌به‌رزه و گوێــدرێژانی بــارکرد و بــۆ فرۆشــتن بــردییه گونــده‌کانی ده‌وروبه‌ری که‌رکوك، نـزیکه‌ی دوو مـانگی پێ چـوو که گه‌ڕایه‌وه، کاتێ که هـاته‌وه مـانگی ڕه‌مه‌زان بـوو، نزیکـی بـانگی ئێـواره بـوو که گه‌یشـته‌وه نزیـک گونـده‌که‌ی، قـۆریه و تکـری و چـا و ئـاو و که‌مێـک نـانی و خورمـای پێ بوو، جـا ئاگرێکی هه‌ڵکـرد و قـۆریه‌که‌ی وه‌سـه‌رنا. چـاوه‌ڕێی ده‌کـرد مه‌لا بانـگ بـدات و به‌ربانـگ بشـکێنێ. پیاوێـک به نـاوی (کوێخـا بـرایم)، بـاره دارێکـی له هێسـتره‌که‌ی نـابوو، له شــاخ به‌ره‌و ئـاوایی ده‌گه‌ڕایه‌وه، که گه‌یشـته لای مام خه‌لیفه و چاوی پێکه‌وت! پێی ووت: ئای خه‌لـیفه ئه‌وه تۆماویـت؟! ئه‌ویـش پێی گـووت: وه‌ره بـا لێره به‌ربانـگ بشـکێنین ئه‌وجـا به‌یه‌که‌وه ده‌چینه‌وه ئاوایی. کوێخا برایم ووتی: ئه‌وه باسی چ ده‌که‌یـت، ده‌مـێکه پرســه‌مان هه‌ڵگرتوویــت، وامــان زانـی مردوویــت. ئێســتاش به‌ته‌مـای لێـره دابنیشــی و به‌ربانــگ بشــکێنیت و دواتــر به کــاوه‌خۆ بگه‌ڕێیـته‌وه ئـاوایی و مـاڵه‌که‌ت؟ جـا کوێخـا قـۆریه‌که‌ی ده‌سـتداێی و ئـاوه‌که‌ی له نـاو ئـاگره‌که کـرد. خه‌لـیفه پێی ووت: حه‌ک ماڵـت وێـران نه‌بێ، جا خۆ ماڵی من له ناو گوند نییه، له نێو چۆمه‌که‌یه له‌لای ئاشی ئاو، هه‌تاکو ده‌گه‌مه‌وه ئه‌وێ و حه‌یشی خێزانم به کاوه‌خۆ خواردنم بۆ ئاماده‌ده‌کا، نیوه‌شه‌و دادێ...

****　　　****　　　****

## باخچەی خەلیفە

پیاوێک بە ناوی خدر پێیان دەگووت (خەلیفە)، پیاوێکی زۆر کۆمیدی و قسەخۆشـــە و بە کەلەش بچـــووک بـــوو. هەر بە بینینـی پێکەنینـــت دەهـــات. دایـــم ڕیشـــێکی ســـپی بەردابـــۆوەوە و چـــۆغەڵی لە ڕەنگێـک و شـەڕواڵی لە ڕەنگێک، چوار پێنج پینەش بە جلەکانی وەبوو. ڕۆژێک لە نـاو بـاخچەکەی لە ســالانی ١٩٦٠ هەنـدێ شـتڵە تەمـاتە و تـووتنی کردبـوو، دوو بـار کفـری بە بـاری کەر هێنـابوو، بەتەمـابوو کفرەکـان بەسـەر شـتڵەکان دابـدات تـا چۆلەکە نەیـان خـوات، حەمەد قـدۆی لە لابـوو، هێشـتا کفرەکانی بەسـەر شـتڵەکان دانەدابـوو، دوو فـڕۆکەی بۆمـب هـاوێژی عێراقی هـاتن، خەلـیفە زۆر لە فـڕۆکەی دەترسـا، بە حەمەد قـدۆی ووت: بـڕۆ بـا خۆمـان بشـارینەوە نەوەک بۆردوومانمـان بـکەن. حەمەد قـدۆ ووتـی: دایکی عبـدالکریم قاسـمت دەگـێم، مـن کەنگینێ لە فـڕۆکە ترسـاوم. حەمەد قـدۆ لەنـاو بـاخچەی غەزری. خەلـیفە خـۆی پێنەگیراو هەڵات، جـا لەوێ ئەشـکەوتێکی لێبـوو هەر چـووە نـاو ئەشـکەوتێ و فڕۆکەکان قونبولەیەکیـان لە گیشـە کفرێـدا و بـاخچەکە هەمـوو ئـاگری گـرت، حەمەد قیـدۆ ترسـی ڕێنیشـت و بە غـاردان هەڵات و لە زارکێ ئەشـکەفتێ لە خـۆی چـوو. خـدریش لەگەڵ تەقینـەوەی قونبەلەکان لە ترسـان کونـدە میزێکی بەخـۆداکرد، پـێڵاوە لاسـتیقەکانی پڕمیز بـوون. منـدارەکانی قیرۆی کە (مسـتەفا و ڕەسـوڵ) بـوون، خۆیـان دە ئەشـکەفتێ کـرد، یەکی کەدە چرووێکیـان لە دەسـت بـوو، هەوڵیانـدابوو ئـاگرەکە بکـوژێننەوە، کە خەلیفەیـان بینی! پێیـان ووت: خەلـیفە ئەوە بـاخچەت سـۆتا، ئەوە ئەتـوو چ قـونەدەی بە بەری ئەشکەفتێوە، بڕۆ ئاگرەکەی بیکووژێنەوە. خەلیفە خۆی شێلو نەکرد

و ووتی: سندان له کفر و باخچەیدا، مادام به خۆ چم لێ نەهات، باخچەم بۆچییه با بسوتێ لێیگەڕێن...

**** **** ****

## شەڕە بەرد و شەڕە کوتەکی جاران...

کات دوای نان خواردنی ئێواره بوو، له ئاواییەکەی بەرامبەرمان هات و هاوارێکی زۆر دەنگی دایەوە، خەڵکێکی زۆر له بەرامبەر ئاواییەکه ڕاوەستابوون و گوێیان قوڵاغ کردبوون، کەس نەدەوێرا بەرەو ئەوێ بچێ. کاتێ هات و هاوار کەم بوویەوە، جا هەندێ پیاو بەرەو ئەوێ غاریان دا، که گەیشتن شەڕە بەرد هەر مابوو، زۆربوون ئەوانەی که به بەرد و کوتەك برینداربوون، ژنێک لووتی شکا بوو، پیاوێک سەری شکابوو، یەکێ قاچی، یەکێ دەستی، جا هەریەکەو له ژێر سواندەیەکدا کەوتبوو. تیمی فریاکەوتن ژنەکه و مێ بریندار تریان سواری ئۆتۆمبێل کرد و ڕەوانی نەخۆشخانەیان کرد. له ناکاو کوتەکێکیان به هەموو کەیفی خۆ له پشتی یەکێك له بەرڕەوانیکەرەکاندا و دەم و دەم بەر زەوی کەوت، دواتر هەڵسایەوە و سێ بریندار تریان دۆزیەوە، ئەوانیشیان به ئۆتۆمبێل ڕەوانی نەخۆشخانه کرد، ئەوه سەیر بوو! بریندار هەردوو لای شەڕکەرەکەیان سواری یەك ئۆتۆمبێل دەکرد، ناڵه و هاواری بریندار هەردولا تێکەڵ دەبوو. ئەو گوڵدانانەی لەسەر دیواری ماڵەکان دانرابوون گوڵدان نەمابوو بەردێکی بەر نەکەوێت و نەکەوێتە خوارێ.

ژن و پیاو و منداڵ هەر یەکێك کوتەکێك و چەند بەردێکی پێ بوو، خەڵکی دێ هەموویان شەڕکەر بوون، تا درەنگانی شەو شەڕو هەرا بوو، کەس نەدەوێرا لەبەر ویرەی بەردان سەری خۆی بەرز بکاتەوە، شەڕکەرەکان زۆر هیلاك بوون و هەموویان کفت کەوتن و شەڕەکە کۆتایی هات، برینندارەکانیش بە سەرو دەست پێچراوی هێنرانەوە ماڵەکانیان...

**** **** ****

## فەیزە ڕێوی و بەڵای لابەلا...

مام فەیزە لە تەمەنی منداڵیدا دوو سێ فەرخە ڕێوی گرتبوون، لەو ڕۆژەوە پییان دەووت فەیزە ڕێوی، ئەویش زۆر بەو نازناوە تێک دەچوو، کوشتنی پێ خۆشتر بوو. ڕۆژێك پیاوێك بە دوای کڕینی پێستی ڕێویدا دەگەڕا، پاشۆڵێکی پێستە ڕێوی لە خۆ هەڵدا بوون و بانگی ڕادێشت: کێ پێستە ڕێوی هەیە بۆ فرۆشتن؟ بە نرخێکی باش لێی دەکڕم. جا یەکێک لە هاوڕێکانی مام فەیزە پێی ووت: بڕۆ ئەو ماڵەی بەرامبەرمان ئەو پێستە ڕێوی فرۆشتنی هەنە، ناویشی مام فەیزەیە. جا پیاوەکە چوو لە دەرگایدا و مام فەیزە دەرگاکەی کردەوە و پیاوەکە پێی ووت: هاتووم پێستە ڕێویەکانت لێ بکڕم! مام فەیزە گۆپاڵێکی لە دەست بوو، کە گوێی لە وشەی ڕێوی بوو گوپاڵەکەی هەڵێناو پێی ووت: هەی قەحپە بابی سەگباب، پێستە هەرامەم لە کێ بوون. کامە گەواد تۆی بۆ لای من ناردووە؟ کابرا پێڕانەگەیشت وولامی بداتەوە، مام فەیزە یەك دوو گۆپاڵی خێوراندنێ. کابرا پێستە ڕێویەکانی فڕێدان و هەڵات، پێستەکان لە بەر دەرگای ماڵی مام فەیزە بە گۆڕێ وەربوون، دواتر هەر

کەس بەوێـدا تێـدەپەڕی دەیگـووت: مـام فەیـزە ئەو هەمـوو پێسـتە هەرامەت لەکێ بـوون؟ مـام فەیـزە تـوڕەیی گرتبـووی و وڵامی کەسـی نەدەدایەوە، بە تەڕدەستی هەموو پێستەکانی لە نێو خرارێك کردن و لە کاتی شەودا بردنی لە دەرەوەی ئاوایی هەڵیڕشتن و گەڕایەوە ماڵێ...

مام سەمەر منداڵە نەخۆشەکەی خستە ناو ئاوی سارد...

مـام سـەمەر لە گونـدی دواوێ دەژیـا. ڕۆژێـک چـووە نـاو بـاخچەکەی و بینی چەنـد منـداڵێک خەریکی تـرێ و هەنـار دزیـن بـوون، دەنگیـدان و ئەوانـیش هەڵاتـن، یەکێکی لەڕو لاوازی گـرت کە نەخـۆش بـوو، مـام سـەمەر نەی دەزانی نەخۆشـە، بەرزی کـردەوە و هەڵی دایە نـاو ڕووبـار. جـا وەرزی پـایز بـوو، ئـاوەکە زۆر سـارد بـوو. منـاڵەکە بەلاکەلاك لە ئاوەکە هـاتە دەرێ و کە چـووە ماڵەوە دایکی ووتی: ئەوە بۆ تەڕ بووی؟ ئەویش ووتی: مام سـەمەر هەڵی دامە ناو ڕووبار. ئەیەڕۆ چۆن دڵی هات منـاڵێکی نەخـۆش بخـاتە نـاو ئـاو؟! چەنـد ڕۆژێکـی پێچـوو منـاڵەکە نەخۆشـیەکەی پەڕانـد، دایکـی ووتـی: هەبـێ و نەبـێ بە هـۆی ئـاوە ساردەکەوە نەخۆشـیەکەی پەڕانـدووە. چـووە لای مـام سـەمەر و پێی ووتـی: خـوا خێـرت بنووسـێ سـەمەرۆکە، لەو ڕۆژەوەی کوڕەکەمـت هەڵداوەتە ناو ڕوبـاری، نەخۆشیەکەی پەڕاندووە. مام سـەمەر کەوای بیست ووتی: بریا دەستم شکابانە، ئەگەر دەمزانی نەخۆشـەو بە ئاوی سـارد چـاك دەبێـتەوە، لە پشـتێم دەکـرد و بـۆم دەهێنـایەوە مـاڵێ، هەڵمـنەدەدایە نـاو ڕوبـاری، بەنەخۆشـی ئەچـۆ سـەر پەلێ هەنـارێ و هەناری لێدەکردنەوە، ئەی بە ساغی دەبێ چ بکات...

**** **** ****

## بەدوای کوڕیە بزربووەکەیدا دەگەڕێ...

ڕۆژێک مام سەمەر خەریکی ڕەز کێڵان بوو، مێگەلە بزنێک هات و بە ناو ڕەزەکەی کەوت و پەسیرە و پەلکەکەیان خوارد، مام سەمەر چوو کامە کوری جوان بوو لەسەر شانی دانا و بردیەوە ماڵەێ و بە ژنەکەی ووت: ئەم کوریە بکوژەوە و بیکە قەرێ، بەشی دوو سێ ڕۆژمان دەکا. جا ژنەکەی هەڵسا کوشتیەوە و چایکرد و کردیە قەرێ. خاوەنی کوریەکە ناوی (خدر پەشێو) بوو، هات و لە مام سەمەری پرسی ؟ هیچ کوریەکت نەبینیوە، ڕەنگی زەردە و قۆچەکانی درێژن ؟ مام سەمەر پێیووت: وەرە جارێ نانی نیوەڕۆ بخۆ، جا پشت بە خوا دەیدۆزینەوە. جا دانیشتن و مام خدر و مام سەمەر تێرو پڕ قەرێیان خوارد، مام خدر ووتی: بەخوا قەرێیەکی خۆش بوو، هەتا مەشکم هێشا خواردم، مام سەمەر ووتی: بخۆ پتر بخۆ ماڵی خۆتە. جا مام خدر بەتەمابوو هەڵسێ و بگەڕێ بۆ دۆزینەوەی کوریەکەی، مام سەمەر پێی ووت: بۆی مەگەڕێ، نیوەی گۆشتەکەت خوارد، مام خدر تێگەیشت و گووتی: یاخوا دەستت خۆش بێ، لە ژیانمدا وەك ئیمڕۆ لە تێری گۆشتم نەخواردووە، جا بەرەو ماڵ گەڕایەوە...

**** **** ****

## کونە کۆتر...

ئەشـــکەوتێک لە ڕۆژئـــاوای گونـــدی دواوێ هەیە، زارکەکەی ڕووی لە ئاسـمانە، خەڵکی بۆ چـوونە نـاوەوەی خۆیـان بە گوریسـێک وەدەکەن، نـاوی ئەشـکەوتەکە کـونە کـۆترە، پـڕە لە هـێلانەی کـۆتر، زارکەکەی تەسـکە، بەڵام کە دادەبەزیـتە نـاوەوەی فـراوان دەبێ و ئەشـکەوتێکی قـووڵە، گـوریس و نیوێـک دەبێ، جـا ئێسـتاش خەڵکی دەڕۆن لە نـاو ئەشکەوتەکە کۆتر و هەندێ جار قـاژیش ڕاو دەکەن. لە دەور و بەری سـاڵانی ١٩٦٠ مـام سـەمەر و سێ چـوار هـاوڕێی، یەکێکیـان نـاوی مـام سـمایل بـوو، دەچـن بۆ ئەم کونە بۆ ڕاوە کۆتر. دوو گوریسـیان پێ بـوو، یەکێکیـان لە دارێک لە دەرەوەی کونەکە بەسـتەوە و سـەرەکەی تریـانن شـۆڕ کـردەوە بـۆ نـاو ئەشـکەوتەکە. دەڵـێن مـام سـەمەر تـۆ مەیە نـاو ئەشـکەوتەکە مانـدوو دەبـی، هەر کۆترێکمـان گـرت لەنـاو گوشـێکی دەکەیـن و لە سـەری گوریسـەکە دەیبەسـتینەوە و تـۆ هەڵیکێشـە. جـا چـوونە ژوورەوە، بە چـیلکە دار کەوتـنە گیـانی قـاژ و کـۆتر و زۆریـان کوشـتن و لەناو گووشیان کـردن و لەسـەری گوریسـەکەیان بەسـتەوە و ووتیـان: مـام سـەمەر هەڵیکێشـە. ئەویش هەڵیکێشـا، جـا مـام سـەمەر سـەری بەسـەر کونەکەدا شـۆڕکردەوە و پێی ووتـن: بـۆ خۆتـان ئیمشـەو لەنێو ئەم کونە پشـو بدەن و منیش دەچمەوە و قاژ و کۆترەکان دەبەم و دەیـانبرژێنم و دەیـانخۆم. گوریسـەکانی بـۆ هەڵـدانە نـاو کـونەکە و فەردەی پـڕ لە کـۆتر و قـاژی لە پشـتێ هەڵـدا و بـۆ مـاڵەوە گەڕایەوە. ئەوانـیش لە کـونەکەدا هێنـدە برسـی بـوون و مانـدی بـوون، هـیچ ڕێگایەکیش نەبوو بۆ هەڵکشـان و هـاتنە دەرەوە، ئێوارە درەنگیش بـوو هیچ شـوانێک لە شـاخ نەمابوو، جـا بە ناچـاری لەناو کونەکەدا مانەوە.

مام سەمەرِیش لە ماڵەوە بۆخۆی گۆشتەکەی دەبرژاند و دەیخوارد، کەس و کاری ئەوانەی لە ناو کونەکەدا گیریان خواردبوو، هاتن بۆ لای مام سەمەر و لێیان پرسی: فرانکەس و فیس کەس لە کوێن بۆ نەگەڕنەوە؟ چییان بەسەر هات؟ ئەویش ووتی: ئەوان ماندوو بوون، لەنێو کونە کۆتر خەریکی پشودانن! جا هەموویان بەو شەوە بەرەو شاخ بەڕێکەوتن، چەند فانۆسێکیان پێ بوو پێش خۆیان پێ رووناك دەکردەوە، گەیشتنە کونەکە و دوو گوریسیان لە یەکتری گرێ داو بۆیان دائێشتنە خوارێ و یەك لە دوای یەك خۆیان بە گوریسەکەوە کرد و لە کونەکە هاتنە دەرێ...

****          ****          ****

## وەیسە شێت لە دایکی خۆی دەدا...

وەیسە پیاوێکی گەنج و غەریب بوو، لە هەرەتی گەنجییەتی دا بە تەواوی باری دەرونی تێکچوو. هەموو رۆژێ لە ماڵ هەڵدەهات و کەس وکارەکانی بەدوایدا دەگەڕان و دەیانهێنایەوە، هەندێ جار گەر پێیان نەگیرابایە، وازیان لێ دەهێنا و دواتر خۆی دەگەڕایەوە. باوکی مردبوو، تەنها دایکی مابوو، ئەویش بەتەمەن بوو. گەر شەوان وەیسە لە ماڵ بووایە بالیفێکی هەڵدەگرت و دەچووە سەربان و لە پێش خۆی دایدەنا و دەیووت: ئەمە تەلەفزیۆنی منە، عەرش و قورش نیشان دەدا. جا لەگەڵ بالیفەکەی دەکەوتە قسەکردن، کەس نەیدەزانی چی دەڵێ. رۆژێک دایکی پێی ووت: کورم هەڵسە کەرەکەت کورتان بکە و برۆ بارە چیلکەیەك بهێنە، دەمەوێ نان بکەم، نە نەوتمان هەیە نە غاز،

وەیسە گوێی پێ نەدا. دایکی وازی لێنەدەهێنا هەموو ڕۆژێ پێی دەووت مێشکی کلۆراندبوو. ڕۆژێک وەیسە کەرەکەی کورتان کرد و بە دایکی ووت: دایکە وەرە با بڕۆین بۆ شاخ چیلکان خڕ بکەینەوە و بیانهێنینەوە. دایکیشی بە خۆی ووت دیارە باشتر بووە. جا بە پێشی کەوت و چوونە شاخ. لەوێ ژنێکی گوندەکەیان بینی ناوی سەلمێ بوو، زۆر لە وەیسەی دەترسا، کە وەیسەی بینی دەستی بە لەرزین کرد، ئەوانیش ووتیان: پوور سەلمێ ماندوو نەبی. پوور سەلمێش بە زمانێکی شڕ و شەپرێو و شکاوەوە ووتی: بە خێر بێن، بۆ خۆتان ماندوو نەبن. کەمێک لە پوور سەلمێ دوور کەوتنەوە و وەیسە دوو چیلکە داری هەڵگرتن و بە دایکی ووت: خۆ ئەوە چەند ڕۆژە مێشکت بردوم! بە دار و چیلکە کەوتە گیانی، دایکی دەستی بە هات و هاوار کرد، پور سەلمێ کە گوێی لەو هات و هاوارە بوو لە دوورڕا هەڵات، چیلکە و گوریسی بەجێ هێشتن، ڕاکردنێکی وا بەو تەمەنە بەسەر دار و بەردا بازی دەدا، جار جار لیچکە کەواکەی لە شتێک دەئاڵاو دەماودەم بەردەبوویەوە، دەست ودەم و چاوی هەمووی بووبوو بە خوێن، هەرچۆنێك بێ خۆی گەیاندەوە ئاوایی و ماڵەکەی. وەیسەش هێندە لە دایکی خۆی دا، هەموو جەستەی خوێن بوو. جا وەیسە دایکی سواری کەرەکەی کرد و بۆ ماڵەوە بە ڕێ کەوت. دایکیشی لەسەر کەرەکە خۆی پێنەئەگیرا و وەیسە باسکێکی گرتبوو تا بەرنەبێتەوە. کە گەیشتەوە ماڵ، خەڵك لە دەوری کۆبونەوە ویستیان لە کەرەکە دایبەزێنن، هەر شوێنێك دەستیان بۆ دەبرد، بە لێدان گوابوو، یەك بەخۆ هاواری دەکرد و دەیگووت: دەست نەدەنە لاقم، دەست نەدەنە پشتم... بە ئەستەم توانییان لە کەرەکە دایبەزێنن و بیبەنە ژورێ، بۆ

مـاوەیەکی زۆر لە مـاڵ کەوتبـوو هەتـاکو چـاکبوویەوە، لەو ڕۆژەوە وەیسەی بۆ هیچ کارێك ڕانەدەسپارد...

**** **** ****

## شەڕی هەرس و حاجی کاکە...

حاجی کاکە، خاوەن مێگەلە مەڕێکی زۆر بوو، هەموو ساڵێ لە کۆتایی وەرزی بەهاردا کـۆچ و کۆچباریـان لێئەنـا و لە گونـدەکەوە دەچـوونە سـەر کانیاوێـك لە شـاخەکە، لەوێ لەوەڕێکـی باشـی لێبـوو بـۆ مێگەلەکەیـان، لە جـێ واری خۆیـان باریـان ئەخسـتن و کەپـر و ڕەشـماڵمان هەڵـئەداو تـا کۆتـایی وەرزی هـاوین لەوێ دەمـانەوە. ڕۆژێ بەتەنهـا لە لای مەڕەکـان بـوو لە چـۆڵگەیەک هـیچ کەسـێک لـێ دیـار نەبوو، لە نێو دۆڵێکدا، هەرسێکی لێ ڕاسـت هـات و لێ نزیـک کەوتەوە، ئەوەنـدە ناشـیرین و بە سـام بـوو تـرس لە گیـانی نیشـت، بەڵام ورەی بەرنەدا، چەکێکی پێ بـوو نـاوی سێتیر بـوو، فیشـەکێکی ڕەپێش کـرد و تەقاندی و لە پەراسـوی هەرسـەکە یدا، بەڵام هەرسـەکە هێنـدە بە هێز بـوو وەک نەوەبـوو هەر پێینەکەوتبێ، فیشـەکی دووەمـی بـردە بەر سێتیرەکەم و تەقانـدی و بەر ملی کەوت، هیچی تـر پێڕانەگەیشـتم لێی بـدات، چـونکە چەکەکە زۆر بە زەحـمەت بـوو، دەبـوایە هەمـوو جـارێ فیشـەکێکی تێ بکـات و سـواری بکـا و جـا بیتەقێنێ. دەرفەتـی هەڵاتنی نەمـا هەرسـەکە خـۆی گەیانـدێ و چەکەکەی لە دەسـت فـڕێ دا و بە چەمبـێڵە گەورەکـانی کەوتە لێـدانی سـەر و گیـانی، هەرسـەکە هەر چەمبێڵێکـی لـێ ئەدا پـڕ بە دەم لە هـاڕژنی ئەدا و هـاواری ئەکـرد،

جینجرۆقی وای لێ ئەدا هەمـوو جەسـتەی برینـدار کردبـوو، خـوێی دەچـۆڕایەوە جلەکـانی زیـوار زیـوار کـرد و وای شـێلابووە سـەریەک لە باوەشـی دا هەر دەتـووت منـاڵی سـاوایە، هێنـدە شـل و شـۆق لە ناکاو بەری هەڵدا و فڕێیدا و کەوت بە سـەر زەوی. جا حـاجی کاکە خـۆی بێ هـۆش کـرد بۆ ئەوەی وازی لێ بهێنێ. ورچەکە لەسـەر سـەری لاکەوت و کەمێ دوور کەوتەوە و پـاش کەمێـک گەڕایەوە تـا دڵنیـا بێ لەوەی کە مردووە، گوێی نا بە سـەر سـنگ و حاجی کاکە هەناسـەی ڕاگرت و خۆی بێ دەنـگ کـرد و ئەویـش لێی دوور کەوتەوە و لە دوورڕا هەرتووترەکا و خـوێنی برینی خـۆی دەلێسـتەوە و چـاودێری دەکـرد. بـۆ جـاری دووەم هەرسـەکە گەڕایەوە سـەری و چنگی لەسـەر سـنگی حـاجی کاکە دانـا و ئەویـش وەک مـردو خـۆی بـێ جـووڵە کـرد، هەرسـەکە ئەم جـارە بە تەواوەتی دڵنیـا بـوو لەوەی کەوا مـردووە جـا ڕۆیشـت و دوور کەوتەوە، هەر هەنگاوێکیشی دەنا ئاوڕێکی دەدایەوە و مۆڕەیەکی ئەکرد<

جا کە بەتەواوەتی دوورکەوتەوە، حاجی کاکە بە شڕە شڕ خۆی گەیاندە لای چەکەکەی. کات ئێوارەبوو خەریک بوو ڕۆژ ئاوابێ و بە برینداری و پەشۆکاوی و هیلاکی بەسەر زگی بریندار خۆی گەیاندە شوێنێک بەرەو مـالەوە بـوو، ئاگای لە مەڕەکان نەما ئاخۆ چییـان بەسـەر هـاتووە. جـا هەنـدێک فیشـەکی پـێ مـابوو، چـوار پێنجێکـی تەقانـدن تـا کەس و کارەکانی گوێیان لێبێ و بە هانایەوە بچن، کات بووە شەو و دونیا تاریک بـوو، کەس و کاری گەیشـتنە لا، سـواری هێسـترێکیان کـرد و بردیانەوە ماڵێ، مەڕەکانیش بـاش بـوو خۆیـان گەڕابـوونەوە مـاڵ. جـا مـاوەی سێ مانگ بوو لەسەر جێگا کەوتبوو، نەیدەتوانی بجووڵێ...

**** **** ****

## پردی سیرات لە یەک داوەبەن باریکترە...

لە گوندێکدا لە ڕۆژی هەینی، مەلا ئامۆژگاری خەڵکی گوندەکەی دەکرد و دەیگووت: خەڵکینە بۆ خاتری خوا، هیچی تر پشت لە خوا مەکەن، ناو لە دوای یەکتری مەبرن، پاشەملە باسی یەکتری مەکەن، لە ژێر دیوار و سواندە دامەنیشن بە بێ ئیش و کار. کار و کاسبی بکەن، ڕوو لە خوا بکەن ئەگەرنا خوا سزاتان دەدا، ڕۆژی دوایی خوای گەورە پردێك دروست دەکا، ناوی پردی سیراتە، لە یەک داوەبەن باریک ترە! ئەوەی ئیماندار نەبێ ناتوانێ بەسەریدا بپەڕێتەوە، لە ژێریشی دۆزەخە، ئەوی لە خوا ترس نەبێ لە ناوەندی پردەکە بەر دەبێتەوە و دەکەوێتە ناوی، جا قوڕ بەسەر ئەوەی دەکەوێتە ناو دۆزەخ! هەتا هەتایە لە ناوی دەمێنێتەوە و دەسووتێ، جا ئاگرەکەی ئەوێ حەوت هێندەی ئاگری دونیایێ گەرمە. خەڵکەکە هەموویان گوێیان بۆ وتارەکە قوڵاغ کردبوو، هەندێکیان هوڕ هوڕ دەگریان و هەندێکیش کڕوو بێدەنگ بوون، لە پڕێك (عەوڵا بەگ) هەڵسا سەر پێ و بە دەنگێکی گەورە ووتی: خزمینە، چیدی لوشمە لوش مەکەن، ئەوەی مەلا دەیڵێت ڕاست نییە! ئەدی نەتان بینیوە (خدرە ڕووتە) ی بۆ حەوت بزن و کسۆکەکی و شوانەکی، پردێکی بە چەپەر و سێ چوار داری توند و ئەستور و باش، لەسەر ڕووباری درووست کردیە، بە یەک کەڕەت هەموو بزن و شوان و کسۆکەکەی دەپەڕنەوە، بێ ئەوەی یەکێکیان بکەوێتە ناو ڕوباری، خوای گەورە بەو هەموو گەورەیی خۆیەوە، کو؟ دڵی دێ! ئەم هەموو خەڵکەی بەسەر پردەکی بە قەد یەک داوە بەن باریك بپەڕێنیتەوە... خەڵکەکە کە ئەمەیان بیست و بیرهاتەوە، هەموویان هەڵسان و ووتیان: ئۆباڵ بەوی ملەی، قسەی عەوڵا بەگیە...

## کەرێک غەرەزی هیلاکی خۆی لە مام بارام هەڵڕشت...

ڕۆژێک کات دەرە بەهار بوو، تازە پۆخی دار دەپشکوت و خەریک بوو گیا تێرەی مانگاو مەڕ و بزن پەیدا بێ، مام بارام ووتی: با بچمە شاخ و کەمێ دار بێنم بۆ سۆبەی داران و شیو لێنان و نان کردن. کەرەکەی کورتان کردو بەڕێکەوت، ڕۆژێکی زۆر خۆش بوو، تیشکی ڕۆژ لە دونیای دەدا، هەواکەی فێنک بوو، دەستی نا بە بناگوێیەوە و دەستی کرد بە حەیران ووتن. لە دووری ئاوایی گەیشت بە دارستانی دار بەڕوو کەرەکەی مشەمشی وێکەوتبوو دیار بوو هیلاک بوو، بەزەیی پێیداهاتەوە و لێی دابەزی و قەڕاسەکەی گرت و بە پێشی کەوت و خەریکی بەستە و حەیران ووتن بوو، لەناکاو شتێک هێندە بە توندی بە شانی کەوت و بەربوویەوە و بە بەردێکی دادا و دنیای لێ تاریک بوو، پاشان کەرەکە بە هەردوو لاقی پێشەوەی کەوتە سەری و تا ماندوو بوو شێلای و بە قیت و قوزی لە دیاریدا وەستا!. ئەویش خۆی بێ هۆش کرد، بۆ ئەوەی کەرەکەی وازی لێبێنێ وهیچی تر لێی نەدا. پاش کەمێک کەرەکە گەڕایەوە و برێکی تر بە لاقەکانی شێلای، پاشانیش وازی لێهێنا، مام بارام چاوەڕێ بوو شوانێک یان ڕاوکەرێک بێ و لە غەزەبی کەرەکەی ڕزگاری بکا، ماوەیەکی زۆری پێچوو کەس نەهات، سەیرێکی کەرەکەی کرد و بینی رك و کینەی دامرکاوە، پێ دەچوو هیچی لە دڵ نەمابێ و تووڕەیی خۆی هەڵڕێشتبێ، جا بە شرەشر خۆی گەیاندێ و قەڕاسەکەی گرت و بردیە لای بەردێک و سواری بوو، ئەویش وەک ئەوەی هیچ نەبووبێ بەرەو ماڵ کەوتە ڕێ. لە ڕێگادا مام بارام هەر بەولاو بەولا دەکەوت، خەریک بوو بەربێتەوە. کە گەیشتنەوە ماڵەوە منداڵەکانی مام بارام کە باوکیان بەو شڕ و شەپڕێویە بینی! کردیانە

هـات و هـاوار و ووتيـان: ئەوە چى بـووە كێ لێيـداوى؟ ئەويـش ووتـى: سـەرەتا دامبەزێنن جـا بۆتـان دەگێڕمەوە، جـا لە كەرەكە دايانبەزانـد و جێگايان بۆ ڕاخسـت، مام بـارام دەسـتى بە گێڕانەوەى بەسـەرهاتەكەى كـرد و گـووتى: بەيـانى كە چـووم بـارە دارێـک بێـنم، لە پـێش كەرەكەدا دەڕۆيشــتم، لە پشــتڕا پڕيــدامێ و بە لاقەكـانى زۆرى لێــدام، يەكێـك دەربەڕى و دەسـتى دايە مەترەقێـك و هەڵيكوتـايە سـەر كەرەكە و يەك دوو مەترەقـى خێورانــدنێ، بەڵام هەر زوو مەترەقەكەيــان لێســتاند، ئەگەرنا كەرەكەى دەكوشت، مام بارام گووتى: لەپێشـدا كەرەكەم زۆر مانـدو كردبـوو، بۆيە ئەويـش تۆڵەى مانـدوبوونەكەى لێكـردمەوە، بەڵام دواتر بەزەيى پێداهاتمەوە و بە پشتى خۆى هێنـاميەوە. دواى ئەو ڕوداوە مـاوەى دوو مانـگ بـوو بـوو مـام بـارام لەمـاڵەوە كەوتبـوو، دواتـر چـاك بوويـەوە...

**** **** ****

## قادرلە سەرپشتى هێسترەكەيەوە بە پەلبڕى دارێك هەڵاوسكا ...

چەند گەنجێك، يەكێكيـان نـاوى قـادر بـوو، چـوون بـۆ شـاخ دار بەڕوى زۆرى لێ بوو. قـادر بە سـوارى هێسـترێكى بەرز و هاوڕێكانيشى بە سـوارى كەر بەڕێكەوتـن، دەيانويسـت دار بێـنن بـۆ سـوتاندن، كات وەرزى پـايز بــوو. هەنــدێ لەو دار بەڕوانەى كە دەكەوتــنە دەوروبەرى ڕێگــا، چروەكەيان بڕدرا بوو. ئەو قەدانەى كە بە دارەكانەوە مابوون بووبوون بە پەلبڕى تيژ و تونـد. قـادر لە دواى هاوڕيكانى بە سـوارى هێسـترەكەى سـاردان سـاردان دەڕۆيشـت و گـۆرانى دەووت، هاوڕيكانيشـى لە پێشـيدا

سوعبەت و قسەی خۆشیان دەکرد. لە ناو لێرەوار دەڕۆیشتن بە ژێر دارێکدا ڕۆیشتن چرووەکەی لێکرابووەوە و پەلبرێکی لێ شۆڕ بووبووەوە، ئەوانەی لە پێش مام قادردا دەڕۆیشتن، چونکە لە سواری کەر بوون و نەوی بوون، بە بێ کێشە بە ژێری دا ڕۆیشتن، قادریش لە سواری هێسترێکی بەرز، بیری ئەوەی نەدەکرد کە دەبێ خۆی نەوی بکا، هەر گەیشتە پەلبرەکە و لە نێوان ملی و قوچەکەکەی هەڵنگفتوو بە پەلبرەکە هەڵاوسکا و هێسترەکەی لە بندا ڕۆیشت!. قادر کەسێکی کورت و قەڵەو بوو، هەر دەتگووت دێمکەیە بە دارەکەیان وەکردووە. هاواریکرد، خەریک بوو بخنکێ، هاوڕێکانی ئاوڕیان دایەوە و بینییان هێسترەکە بە بێ قادر بە دوایانەوەیە و قادر بە پەلبرێک هەڵاوسکاوە، لە کەرەکانیان دابەزین و قەراسەی هێسترەکەیان گرت و بردیانە ژێر قادر و ئەویش وەك پێشوو لە سەر پشتی هێسترەکە دانیشتەوە و پەلبرەکەی لە قوچەکەکەی کردەوە. جا وەڕێ کەوتنەوە و هاوڕێکانی پێیانووت: ئەوە بۆچ خۆت نیوی نەکرد؟ ئەویش ووتی: ئێوە خۆتان نەوی نەکرد، منیش بیرم نەکردەوە هێستری من لە کەرەکانی ئێوە بەرزترە...

****        ****        ****

## میو انی نا وەخت...

حەوێزە بۆر، هاوڕێیەکی هەبوو ناوی حمد بوو، ئەو بزنەگەلێکی زۆری هەبوو. ماوەیەک بوو نەیبینی بوو، حەزی دەکرد سەردانی بکات. جا بەڕێ کەوت و دەوروبەری ئێوارە گەیشتە ماڵی مام حمد. خێزانی مام حمد نیسکێنەی بە پونگی لێنابوو، ئەوەندە زەریف بوو، حەوێزی میوانی ناوەخت، هەتا سگی هێشا خواردی. سەگێکیان هەبوو کەس نەدەوێرا بە دەوری ماڵیاندا بێ و بچێ، یان گەر میوانێکیان ویستبای بچێ بۆ سەرئاو، دەبا حمد یان کوڕەکەی لەگەڵی بچن. دوای نان خواردن چا و شەوچەرەیان هێنا و شەوەکەیان بە قسەی خۆش و چیرۆك گێڕانەوە بەسەربرد. ژورێکی بەلاوەیان هەبوو، زارکەکەی رووی لە حەوشە بوو، سەگەکەش لە بەر دەرگای ژوورەکە کەوتبوو و وەڕە وەڕی دەکرد. ژوورەکە میوانخان بوو، مام حمد بە حەوێزی میوانی ووت: تۆ لەم ژوورەدا بنوو، هەرکاتێکیش تەنگاو بووی بانگم بکە، من یان کوڕەکەم لەگەڵت دێین. جا حەوێز لە ژوورەکەدا نووست و حمدیش لەگەڵ منداڵەکانی. کاتی نیوەشەو حەوێز ژانە زگی گرت، لە تاو ئازاری زگی لە خەو هەڵسا، هێندە تەنگاو بوو وەخت بوو بە خۆیدا بکات. سەگەکەش لە بەر دەرگا هەر وەڕە وەڕی بوو، حەوێز تاکو تاریك و رونی بەیانی لە زۆرێ مایەوە. حەپەحەپی سەگەکە نەماو لەگەڵ شوان و بزنەکان چوو بۆ شاخ، حەوێز دەرگاکەی کردەوە و بە غاردان خۆی گەیاندە ئاودەستەکانی مزگەوت و خۆی بە ئاودەستێکدا کردو بێ ئەوەی سەیری بکا ئاخۆ کەمی لێیە یان نا، شرواڵەکەی داکەند و هەر بە پێوە لە شیرژنیدا، کەسێك لە پاش حەوێژ بوو، هاواری دەکرد و دەیگووت: کوڕە نەکەی کوڕەنەکەی! کوڕەنەکەی جی،

هەتـا خـۆی خـاڵی نەکـرد، هیچی نەگێڕایەوە و ووتـی: ئـۆخەی خـۆ حەسـامەوە، کابرا ووتی: حەک یـاخوا بە دڕانێ بچی، خـۆ منت عەدم کرد. حەمەد ئاوڕێکی لە دوای خۆی دایەوە! بینی کابرایەکی ئەفەندی، قـات و ڕیبـاتێکی لەبەردابـوو، لە تەپڵـی سـەری بـۆ پێڵاوەکـانی هەر دەتگووت سواقدرایە، کە وای بینی، داوای لێبووردی لێ کردو پێی ووت: تۆش بای لە جێی من هەر وات دەکرد. ئەویش ووتی: داوای لێبووردنی چی، خۆ تاکو یەك مانگی دی، بۆن گوم لێ نابڕێ...

**** **** ****

## بەهەڵەداچوون پیاو شەرمەزار دەکا..

مام بورهان، تابڵێی پیاوێکی قسە خۆش بوو، ئەو لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولـدا پێشـمەرگە بـوو، بنکەکەیـان لە ئەشـکەوتی خەمسـون بـوو، هاوڕێیەکی هەبوو نـاوی (حمیـد) بـوو، زۆر بەهێز بـوو، پیـاوێکی قەڵەوی باسک بادراوی چوار شانە، زۆر جار بە ملانێ لە گەڵ بورهانی هاوڕێ و هـاو خەبـات، مەیـدانیان لە یەکتری دەخواسـتن، بەڵام بەدەگـمەن وابوو، بورهـان سـەربکەوێت، ڕۆژێک لە پێش ئەشکەوتەکەدا بورهـان خەوی لێکەوتبـوو، حەمیـد هەردوو قـاچی گـرتن و بە تەلانێکـدا لە دوای خۆی ڕایکێشـا و تەقەی سـەری دەهـات، لەخەو ڕاپەڕی و هـاواری کـرد: ئەی هـاوار بەرمـدە هەی کافر کوشـتمت. بەرهەڵـدانی چی، هەتـا شـڕ و شـەپڕێوی نەکـرد بەریهەڵـنەدا. ئەم غەرەزە هەر لە دڵیـدا مـابوو، دوای مـاوەیەک لەیەکتری دابـڕاین و هاگایـان لەیەکتری نەمـا. ڕۆژێـک مـام

بورهـان چـووه شـاری کـۆیه، بەنـاو بـازاڕدا دەڕۆیشـت، وەختێـک بینی کابرایەکی قەڵەوی چوارشـانە لە پێشـیدا دەڕوا، جەمەدانییەکی لەسـەر بـوو، پشـتە ملیشـی تـازە تاشـی بـوو، بورهـان وای بە بیرکـردەوە کە ئەمە هەبێ و نەبێ حمیدی هاوڕێی جارانیەتی، جا خۆی ئامادە کرد کە تۆڵەی ئەو ڕۆژەی لێبکـاتەوە کە لە دوای خـۆی ڕاکێشـابوو، تفێکـی لە نـاو دەستەکانی کـرد و خـۆی لێ نزیـك کـردەوە، کابرا ئاگای لە مـام بورهـان نەبـوو، باسـکی بـادەدان و بە قیـت و قـۆزی بە نـاو بـازاڕدا دەڕۆیی، مـام بورهـان خـۆی لەگەڵ ڕاسـت کـرد و لە دواوە بە هەمـوو هێـزی خـۆی شـاقەزلەیەکی لە پشـتەملی کابرا دا! کوڵاوو جەمەدانی کەوتنە بەرپێیان و خۆشـی لە جێی خۆیـدا چەقی و ئـاوی بە چاوانـدا هـات، کە ئـاوڕی دایەوە! مـام بورهـان بینیی ئەوە (حمیـد) ی هـاوڕێی جـارانی نییە!!! شـەرم دایگـرت و ئارەقەیەکی کـرد، خەریک بـوو لە شـەرمان زەوی قـوتی بـدات، بەڵام دیـار بـوو کابرا پیـاوێکی تێگەیشـتوو بـوو خـۆی شـێلو نەکـرد و پێی ووت: حەک ماڵـت وێـران نەبێ، ئەم تۆقـاتەت بـۆ لێـدام؟ دەخـۆ بـرام نەکوشـتووی، دەزانـم بە هەڵەدا چوویـت گەردەنـت ئـازا بێ، بەڵام ئەم بەهەڵەداچوونەت با پەند بێ بۆ هەزار جاری تر...

**** **** ****

## کوڕێک درۆ لە باوکی سپی دەکاتەوە...

پیــاوێکی پیــر هەر لە تەمەنــی منــاڵی ڕاهــاتبوو درۆی گەورە گەورەی دەکردن، پێیاندەووت (سەید وەتمان). ئەو کوڕێکی هەبوو ناوی سەلمان بوو، ماوەیەک بوو مەشقی سەربازی دەکرد. ڕۆژێ سەلمان لە سەربازی مۆڵەتی وەرگرت و گەڕایەوە گوندەکەی، باوکی پێی ووت: دوێنێ چوومە شــاخ، لەوێ کــوارگێکی لێبــوو بە قەد دارێــک بەرز بــوو، بە خــۆم و برادەرێکم دانە ڕۆژێك بە بێوران خەریک بووین تاکو بڕیمانەوە و لەت و پەتـن کـرد، حەوت بـاری هێسـترێی کەوتنێ!! ئەوجـا نـۆرەی کـوڕەکەی هـات، ئەویـش گـووتی: جـا بـاوکە پێرێ بینـیم لە کارگەیەکی مەنـجەڵ دروسـت کـردن، چـل وەسـتا خەریکی دروسـتکردنی مەنجەڵێك بـوون!! هێنـدە گەورە بـوو. باوکی گووتی: حەک لەم درۆیە گەورەیە. سـەلمانیش ووتی: جا باوکە ئەم کوارگەی تۆ باسی دەکەیت، لەم مەنجەڵەدا نەبێ جێی نابێتەوە...

**** **** ****

## مام بارام ومام لاس لەسەر دار کرۆسکێک شەڕیانە...

مـام بـارام و مامە لاس یەکی پارچە ڕەزێکیـان هەبوو، ڕەزەکانیـان لە پـاڵ یەکتریەوە بـوون، تەنهـا چیلەیەکیـان لە نێوانـدابوو، لەنـاو چـیلەکەش دار کرۆسـکێک بە خـۆی ڕوا بـوو، چەنـد سـاڵێك بـوو مـام بـارام و مـام لاس شـەڕیان لەسـەر ئەم دارە بـوو، چەنـد جـاریش دەم و لـووتی یەکتریـا شکاندبوو. دوای شـەڕکردنێکی زۆر، گەیشـتن بەو ئەنجـامەی کەوا دەبێ

بە گفتوگۆ ئەم کێشەیە چارەسەر بکەن، بڕیاریاندا بچن بۆ لای مەلای گوند، کە کێشەکەیان بۆ یەکلا بکاتەوە، جا بە مەلایان ووت، ئەویش ووتی: مادام دار کرۆسکەکە خۆی ڕواوە و کەس نەیچاندووە، ئەوە دەبێ بەرەکەی بدەن بە خەڵکی ئاوایی. جا مام بارام و مام لاس دوایی کە لە لای مەلا ڕۆیشتن ووتیان: ئێمە چەند ساڵە شەڕ لەسەر ئەم دارە دەکەین، ئێستاش خەڵکی ئاوایی بەرەکەی بخوات، نا بەخوا واناکەین. ئەو ڕۆژە هیچیان بە هیچ نەکرد، بڕیاریاندا بچن بۆ لای میرانی دەڤەرەکەیان. میران پیاوێکی ڕیش سپی و پیاو ماقوڵ بوو، میوانخانەیەکی گەورەی هەبوو، جا مام بارام و مام لاس بەڕێ کەوتن بۆ میوانخانەکەی، ئەو ڕۆژە دە دوازدە پیاوماقوڵی لێبوون، لە میوانخانەکە، جا کە دانیشتن میران ووتی: چییە؟ مام بارام و مام لاس، کێشەیەکتان هەیە، چۆنە هاتوون بۆ ئێرە؟ مام بارام ووتی: جا چیت لێ بشارینەوە قوربان، لە گەڵ مام لاس کێشەمان لە سەر دار کرۆسکێکە، با وای دابنێین من پارچە ڕەزی خۆمم و مام لاسیش پارچە ڕەزی خۆیەتی و جەنابیشت چیلەیەکی لە نێوانماندا، دار کرۆسکێک لەنێو تۆدا ڕوواوە کە چیلەکەیت! ئێستا ئەم دار کرۆسکە هی کامەمانە؟ میران تووڕە بوو و ووتی: منت کردە چیلە و دار کرۆسکێکت تیادا ڕواندم! هەستە لێرە نەمێنی هەی سەگی سەگباب...

**** **** ****

کوێخا کاکۆ و کەڵەبابی مام خدر و مەلیك سەلامی لێ کردی...

کوێخایەک هەبوو ناوی (کاکۆ) بوو، پیاوێکی باڵا بەرز و قسە لە ڕوو دڵ ئاوا بوو، خاوەن قۆناغ و دیوانخان بوو، میوانی زۆری دەهاتن، لە پیاوانی میرییەوە تا ئاغا و کوێخاکانی ناوچەکە و دەوروبەری. هەر میوانێکی دەهات خواردنی باشی دەدایێ، خەڵک زۆر دەیان ناسی، ناویشی بە نان دەر دەرکردبوو. کوێخا گەر میوانی هاتبا، هەر جارە و بۆ ماڵێک کەسێکی دەنارد کە گیسکێک یان کەڵەشێرێک یان مریشکێکی بۆ بنێرن تا میوانەکانی پێ دەعوەت بکا، بەڵام تا خۆی هەیبایە نەی دەنارد بۆ ماڵی هیچ کەسێك. لە گوندەکە پیاوێک هەبوو ناوی مام خدر بوو، چەند جار کوێخا مریشک و کەڵەبابی لێ داواکردبوو، هەرچەندە زۆریشی لە دڵ ناخۆش بوو. مام خدر تەنها کەڵەبابێکی مابوو، ڕۆژێک ووتی: با ئەم کەڵەبابەم بکەم بە زیافەتێک بۆ منداڵەکانم، تا کوێخا ئەویشی لێ داوا نەکردوم. جا بەتەمابوو بچێ کەڵەبابەکە بگرێ و بیکوژێتەوە، لەو کاتدا کوێخا هەندێ میوانی هاتن و پیاوێکی نارد بۆ لای مام خدر کە کەڵەبابەکەی بۆبنێرێ، مام خدر بە پیاوەکەی ووت: تۆ بڕۆ بە مناڵەکان دەڵێم بیگرن و خۆم دەیهێنم. جا گرتیان و مام خدر کەڵەبابەکەی لە بن هەنگڵی ناو چوو بۆ ماڵی کوێخا، کوێخا پێی ووت: دەست خۆش مام خدر، جا بۆ خۆت بڕۆوە و کارێک بکە، مام خدر ووتی: بەخوا هەر ئەم کەڵەبابەم مابوو، تا لێی نەخۆم ناڕۆم... ڕۆژێکی تر کوێخا چەند ئاغا و کوێخایەکی میوان بوون، سەماوەر گزەی دەهات، هەندێ لە پیاوەکانی کوێخا چایان دادەنا و هەندێکیش ناویان دەگێڕا. کوڕێک کە خزمی کوێخا بوو ناوی (ئۆمەر) بوو، ماوەیەک بوو چوو بوو بۆ سەربازی، چەند ڕۆژێك مۆڵەتی وەرگرتبوو، هەر ئەو ڕۆژە

هـاته لای کوێخـا، جـا وەژوور کەوت و هەمـوویـان لەبەری هەڵسـان و یەکە بە یەکە تـۆقەی لەگەڵ کـردن، ئەو کات چـوونە سـەربازی گـرنـگ بوو، گەر یەکێ چووبا سـەربازی دەیانووت: ئەوە دونیای دیوە و بووە بە پیـاو. جـا پاشـان دانیشـتن و هەریەکێـك پرسـیارێکی لێ کـرد، یەک دەیـووت: سـەربازی خۆشـە؟. یەک دەیـووت: چەنـدت مـاوە سـەربازی تەواو بـکەی؟. ئەویـش یەکە بە یەکە وەڵامـی دەدانەوە. پاشـان بە دەنگێکی بەرز بـۆ ئەوەی دانیشـتوان گوێیـان لێ بـێ، بە کوێخـای ووت: کاکە، مەلیـک سـەلامی لێ کـردی!! کوێخـا کە ئەمەی بیسـت تـوڕە بـوو و پێی ووت: همـاهی هەرەزڕای!! مەلیـك ئەمـن مانامـی؟ نـان و پیوازمـان بەیەکەوە خواردووە؟ ئەو مەلیکی عێراق و منیش کوێخای گوندێک...

**** **** ****

## کو قەڵاتم لێ بزربوو

سـاری ١٩٨٨ بـوو ١٣ سـاری بـووم ماریشـمان لە رانـیەی بـوو, دەبـوو بە دزی مـارێ بچـمە هەولێرێ , لـۆ مـارێ خوشـکم, ماریـان لە قەراتـێ بـوو قەراتیش هەموو خۆشناو و خەرکی مەنتیقەی بوون ,لە گەراجی رانیەی حەمەقەڵەوی هـاوارە کـرد یەك نەفەر هەولێر ئەمنـیش چـووم گـۆتم دێمە هەولێرێ پاشی مشـتومڕەکی زۆر لە پێشی کرِاونێ سـوار بـووم , لە فلکەی چنارۆکێ داخیلی هەولێرێ بووین.

مــابەینی هەولێـرێ و کەسـنەزانی دەشــت و مەیـدان بــوو,هەر لە کەسنەزاني ڕا قەراتم لێ دیار بوو ترسم نەبوو چونکە قەرات برند بوو هەولێریش بێجگە لە یەك دوو بینایان زیاتری لێ نەبوو,پیرە کرِاون هـات

هـات هەتـا لەپـێش اعـداديە كوردسـتانی راوەسـتا و گـۆتی دابەزن، ئەمنـیش زۆر بە مسـێتەڕی  دابەزیـم وەكی چـاوم گێڕان چ قەرات ديـار نەبوو، بڕەكم خۆ خافراند و غیرەتم دا بەرەخۆ بەرام چ فايدەی نەبوو دەستم بە گريانێ كرد پەڕیمەوە بەری فندق زەهەبی( دم دم) ی لۆ لای ئەمنی بەلدەی چووم قەرات هەر ديار نەبوو،

كۆمەرە منـدارەكم لێ پەيـدا بـوون هەمـووی هەشـت نـۆ سـاری گۆتيـان: ئەوە لۆ دەگريێ كێ لێدای؟

گۆتم: كەس لێينەداوم , قەڵاتم لێ ون بووە.

گۆتيان: خەركی كێندەری؟

گۆتم : خەڵكی رانيەم.

زۆريـان زگ پێسـۆتام دەسـتيان گـرتم لـۆ قەراتێ وەڕێ كەتـين منـداريش هەر زيـادە بـوون، ئێـك دەيگـۆ چی فەقيرە، ئێـك دەيگـۆ خەركی رانـيەيە، بـۆوە يەك هۆســەو قەرەبـارغی و بەنــاو گەڕەكـی بيرێژيــان رەتبــووين گەيشـتينە پـێش تەجنيـدی وەكی چـاوم برنـد كـردن قەراتـم كەتە پـێش چــاوان، بەدەســتە خــۆم نەبــوو يەك بەخــۆم لە هارژنــدا و چــرم و فرمێسكم تێكەر بوون گەيشتنە چەنەگەی، دەستی كوڕيژگەی هەشت سـاريم بەردا رێـك لـۆ قەراتـێم غـاردا، وەكی ئـاورەكم لە پشـتەخۆ داوە مندار هەموو لە جێي خۆ واقيان وڕمابوو.

**** **** ****

## سێ جەژن

*-جاران بەتایبەتی تانزیکەی هەشتاکانی سەدەی رابردوو،دیاریکردنی یەکەم رۆژی مانگی رەمەزان ،یان یەکەم رۆژی جەژنی رەمەزان ،بەهۆی کەمی و نەبوونی ئامرازەکانی گەیاندن،بەتایبەتی رادیۆ،کەم هەبووە چەند گوندێك بەیەکەوە ئاگایان لەیەك بووبێ و بەیەکەوە کردبێتیانە رەمەزان یان جەژن،خەڵکەکەش ئەوەندە بەتەقوا بوونە بەو پێیەی(کەمانگت بینی بەرۆژوو بەو کەدیتەوە بیکەجەژن)زۆربەی سالان گوندی خەتێ رۆژێك دوای گوندەکان دەیان کردە رەمەزان و جەژن.

گۆڕی پڕلە نوور بێ،مامۆستا مەلا بەهائەددینی خەتێ،گێڕایەوەو گۆتی:

ساڵی پەنجاکان لە حوجرەی بەحرکە فەقێ بووم،رەمەزان بوو،سەروبەری جەژن بوو،جارانیش وەکوو ئێستا نەبوو،هەموومان بەیەکەوە بیکەینە جەژن،رادیۆش کەم بوو، جێگای واهەبوو تاکوو مانگیان نەدیتبایە نەیان دەکردە جەژن،هەش بوو تاکوو سي پڕي نەگرتبا نەیان دەکردە جەژن.

رۆژی عالف لەبەحرکە بەڕێکەتم شەوێ لەهەولێرێ مامەوە،سبەینی بووەجەژن،ئیدی نانی جەژنن خواردو پاش نیوەرۆیێ بەڕێکەتم مەغریبێ گەیشتمە شەقلاوێ،کەگەیشتم لەشەقلاوی عالفە بوو،بەیانی بووە جەژن و نانی جەژنیشم لەوێ خواردو بەڕێکەتم بۆ گوندی خەتێ،کەگەیشتمە گوندی لەوێش عالفە بوو،بەیانی لەوێش بووە جەژن.

لەماوەی سێ رۆژدا سێ جەژنم کردن...

## جوی پیاو

*- شـێخ نەجیمی شـێخ کاکەمینی بـلەی ژۆری، هەزار رەحمەتـی لێبی، پیاوێك تەواوی ژیانی لە کوردایەتی دا تەرخان کردبوو، گێڕایەوەو گۆتی:

سـاڵی چلەکانی سـەدەی رابـردوو، چـوومە سـەفەری حەج، ئەو کـاتی دەبـوایە یەکەم جـار بچووبـاینە فەلەسـتین و لە قـودس سـەردانی هەنـدی شـوێنی پیرۆزمـان کردبـا، دوای جێبەجێ کردنـی ئەرکەکـان ، چووینە لۆقونتەیەك( مەتعەم) ، بۆ نان خواردن،ئێمەش جەماعەتەك بـووین، دوای نـانخواردن هەسـتاین بچین پـارە بـدەین، کابرای خـاوەن چێشـتخانە، گۆتی پارەکەتـان واسـڵ کـرایە، پێم سـەیر بـوو لەو وڵاتەی کێ هەیە من بناسي ، گۆتمان کێ پارەی خواردنی ئێمەی داوە؟

کـابرا گـۆتی ئەو دوکـان دارەی بەرانبەرمـان، چـووینە لای کابرا،کـابرا بەدوامانـدا هـات و گۆتی یاشـێخ ئەوە نامناسـیەوە؟گۆتم نەوەڵڵا، گۆتی ئەمن فـران کەسـم، جوومە کاتی خۆی ماڵمـان لەمەلەکان بـوو، ئەتـوو زۆر هاوکاریـت دەکـردین و بەرگریـت لێـدەکردین، نەت دەهێشـت کەس غەدرمـان لێبکـات، کابرا یەکی زۆر رێك و پێـك، زۆر تەکلیفی لێکـردین کەوا شـەو بچینە ماڵیان ،